# تیۆری مەعریفە
# لە نێوان قورئان و فەلسەفەدا

......................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لیکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٣٨)


- نووسینی: د. ئەحمەد ئیبڕاهیم وەرتی
- بابەت: توێژینەوەی مێژوو
- تایپ: رابەر ئەحمەد وەرتی
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- چاپی یەکەم: چاپخانەی سڤان

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٢٨٨)ی ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە

## بسم الله الرحمن الرحيم

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢)
اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥)﴾

سورەتی (العلق)

## سوپاس و پێزانین

به پێویستی دەزانم لێرەدا سوپاس و پێزانینم دەرببڕم بۆ برای خۆشەویست و هاوڕێی خوێندنی بالاّم بەڕێز مامۆستا (سیروان مەجید تەمەر) قوتابی ماستەر لە کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکانی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر، بۆ هاوکاری و کۆششیان لە تەواوکردنی ئەم کتێبەدا، خوای گەورە سەرکەوتوویان بکات و سەرفرازی هەردوو جیهان بن.

# ناوەڕۆك

**بەشی سێیەم: قورئان و تیۆری مەعریفە**



**بەشی چوارەم: توانای مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە**

**بەشی پێنجەم: قورئان و توانای بەدەستهێنانی مەعریفە**

# پێشەکی

**بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

توێژینەوە دەربارەی مەعریفە، خواستێکە لە هەر بزاڤێکی رۆشنبیری و فیکریی دا پێی نیازمەندین، مەعریفە کە هەندێ جار وەسف دەکرێت بەوەی بریتییە لەو پەیوەندییەی بەکاریگەری ئالۆگۆڕ لەنێوان کەس و بابەتدا گەشە دەکات، بە سەرچاوەی بەردەوامی بەخشین دادەنرێت، کە بەدرێژایی چاخەکانی مێژوو، فەرهەنگ و کلتورگەلێکی لەبەرەنجامی دا پێکهاتووەو چەندین لق و پۆپی زانست و زانیاری و پێشکەوتنی ژیاریی لێ کەوتۆتەوە.

فەلسەفە بەشێوەیەکی گشتی دیارەدەیەکی مرۆڤایەتییەو بەرهەمی عەقڵی مرۆڤە ئامانجی پەی بردنە بە نهێنییەکانی گەردوون، مەعریفەش بالآترین ئەرکی مرۆڤە لە بووندا، باوەڕو ئیمانیش خۆی زانست و مەعریفەیە.

زۆر زاناو پیتۆڵ و فەلسەفەی جیاجیا چوونەتە نێوقوڵایی باس و خواسەکانی مەعریفەو رێبازگەل و رەوتی جۆراوجۆر سەریان هەڵداوەو مشتومڕی زۆر و فرە ڕەهەندی لێکەوتۆتەوە و پرسیارەکانی: مەعریفە

چییە؟ سروشت و سنوورەکانی چین؟ داخۆ دەتوانریٚ مەعریفە بەدەستبهێنرێت و چۆن و بە چ ڕێگایەك؟ وروژێنراون.

ئەم مشتومڕو پرسیارانە وای کرد چەندین ڕێبازی فەلسەفی سەرهەڵبدەن لە شکگەرایی و یەقینی و واقیعگەرایی و ئایدیالی.. کە هەندێکیان بە بنبەست گەیشتن و نەیانتوانی تەفسیرێکی واقیعی و دڵنیاکەری تەواو سەبارەت بە بوون و مرۆڤ و دەوروبەری و توانای مرۆڤ بۆ زانینی شتەکان، پێشکەش بکەن.

پرسی مەعریفە و زانین لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بووەتە بابەتێکی گرنگ و بایەخدار کە لە فەلسەفەی سەردەمدا پێی دەوترێت تیۆری مەعریفە (نظرية المعرفة) کە لەمیانیدا هەڵوێستی مرۆڤ لە بارەی حەقیقەت و ڕێگا و ئامرازەکانی گەیشتن پێی و ئەو سەرچاوانەی دەیگەیەنن بەڕاستی و یەقین دیاری دەکرێت.

تیۆری مەعریفە شوێنێکی گەورە و گرنگی لە فەلسەفەی هاوچەرخی خۆرئاوادا داگیر کردووەو بۆتە چەك و ئامرازی دەستی فەیلەسوفان لە بابەتگەلی جۆراوجۆردا.

ئیسلامیش لە تیۆری مەعریفەدا خاوەن ڕێبازێکی تەواو و سەربەخۆ و جیایە لە تیۆرو ڕێبازە فەلسەفییەکانی تر هەر لە پێناسە و پۆلێنکردنیەوە تا دەگاتە پایە و بەها و گرنگییەکەی و سەرچاوەو ئامرازەکانی و توانای مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە.

بۆیە لەبەر گرنگی بابەتەکە، بەپێویستمانزانی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی دەربارەی (تیۆری مەعریفە) بنووسین و تاوتوێی بابەتەکانی

بکەین، لەم هەوڵەشماندا کە سەرچاوە بەتایبەت لە زمانی کوردیدا گرفتێکی سەرەکیمان بووە، هەوڵمانداوە ڕوانگەی قورئان و فەلسەفە بە شێوەیەکی سانا و دوور لە ئاڵۆزی لەمەڕ تیۆری مەعریفە و توانای مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی زانست و مەعریفە، روون بکەینەوە. بەشەکانی لێکۆڵینەوەکەشمان بەم شێوەیە دابەشکردووە:

**بەشی یەکەم: دەروازەیەك بۆ باسکردن لە تیۆری مەعریفە.**

**بەشی دووەم: مێژووی تیۆری مەعریفەو پەیوەندی بە زانستەوە.**

**بەشی سێیەم: قورئان و تیۆری مەعریفە.**

**بەشی چوارەم: توانای مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە.**

**بەشی پێنجەم: قورئان و توانای بەدەستهێنانی مەعریفە.**

لەو سۆنگەشەوە کە نووسین دەربارەی تیۆری مەعریفە – نەخاسمە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە– بە زمانی کوردی زۆر کەمە گەر نەڵێین هەر بوونی نییە، بۆیە نووسینەکە دەبێتە توێژینەوەیەکی نوێ و بایەخدار لەم بوارەدا.

هیواداریین توانیبێتمان ئامانجەکە بپێکین و خزمەتێك بگەیەنین بە خوێنەری کوردی و سوودبەخش بێت بۆ گرنگیدەرانی زانین و مەعریفە.

**د. ئەحمەد وەرتی**

**هەولێر ـ ٢٠١٦**

## پێناسەی مەعریفە و زانست

### أ- مەعریفەو زانست لە رووی زمانەوانییەوە:

وشەی مەعریفە لە ماددەی (عرف) بە مانای زانین هاتووە، هەروەك لە (القاموس المحيط)ی فەیرۆزئابادی دا هاتووە: (عَرَفَه يعرِفُهُ مَعْرِفَةً وعِرْفَةً وعِرِّفاناً) واتە (عَلِمَهُ) زانی[1]، پاشان فەیرۆزئابادی و هەروا جەوهەری لە (الصحاح)دا چەند مانایەکی تریان باسکردووە بۆ کرداری (عرف)، وەك: دانپێدانان و پاداشتدانەوە[2].

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مەعریفە حاڵەتێکە ئەوە دەخوازێت کە زانیار (العارف) لەگەڵ زانراو (المعروف)ەکەدا ئاسوودە بێت و دڵی ئۆقرە بگرێت، پێچەوانەی نەزانراو (منكر)، کە ترس و بیم لە نێوان ئەو کەسەی کە زانیاری نییە و لە نێوان نەزانراوەکەدا دروست دەکات، هەروەك جەوهەری و فەیرۆزئابادی مەعریفە بە پێچەوانەی نەزانراو هەژمار دەکەن.[3]

لەو پێناسەیەی سەرەوەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مەعریفە لە بەرامبەر شتی نەزانراودا بەکاردەهێنرێت و ئەو کەسەی زانینەکەی دەست دەکەوێت لەگەڵیا ئۆقرە دەگرێت و ئاسوودە دەبێت، ئەمەش لە

---

[1] مجد الدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي – القاموس المحيط، ط٢، دارالمعرفة، بيروت، ١٤٢٨هـ – ٢٠٠٧م، ل ٨٦٠.

[2] فەیرۆز ئابادی – سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٦٠. اسماعيل بن حماد الجوهري – معجم الصحاح، ط ١، داالمعرفة، بيروت، ١٤٢٦هـ ٢٠٠٥ م، ل ٦٩٤ – ٦٩٥.

[3] هەردوو سەرچاوەی پێشوو، فەیرۆزئابادی ل٨٦٠. جەوهەری ل٦٩٤.

ئاكامی مەعریفە یاخود دەستكەوتنی زانیارییەكەدا بەدەست دێت. بەڵگەی ئەمەش وتەی (ئیبن فارس)ە كە دەڵێ (لأن من انكر شیئا توحش منه ونبا عنه)، واته: كەسێك شتێك نەزانێت بیمی لێی هەیەو دووردەكەوێتەوە لێی[1].

بەڵام وشەی زانست (العلم)، ئەویش لە زماندا بەواتای هەستپێكردن (الشعور) دێت، دەوترێت (عَلِمَ به، كسَمِعَ: شَعَر) واته: هەستی پێكرد[2].

زانست (العلم) پێچەوانەی نەزانین (الجهل)ە، فەیرۆزئابادی وشەی زانستی بە مانای مەعریفە پێناسە كردووە، وەك دەڵێ: (عَلِمَه: كسَمِعَه، علِمًا: عَرَفَه) بەواتای زانی و مەعریفەی بەو شتە پەیدا كرد، جەوهەریش بەهەمانشێوە زانستی بە مەعریفە پێناسە كردووە.[3]

بە كورتی دەتوانین بڵێین مەعریفەو زانست هاو واتان لە رووی زمانەوانییەوە، چونكە هەریەكە لە زانست بە مەعریفەو مەعریفەش بە زانست پێناسەكراون، و هەردووكیان گوزارشت لە حاڵەتێك دەكەن كە بریتییە لە دڵنیایی و ئاسوودەیی دەروونی لای زانیار بەرامبەر شتە زانراوەكە.

---

1 أحمد بن فارس بن زكريا القزويني الرازي، أبوالحسين ت ٣٨٥ﻫ – معجم مقاييس اللغة ، تحقيق عبدالسلام محمد هارون، دار الفكر، ١٣٩٩ ﻫ – ١٩٧٩م، ٢٨١/٤.

2 فەیرۆزئابادی – سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٠٧.

3 الفيزور آبادي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٠٧. الجوهري– سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣٨.

**ب ـ مەعریفە و زانست لە رووی زاراوەییەوە:**

**١ـ مەعریفە:**

**چەند پێناسەیەك بۆ مەعریفە باسكراوە، لەوانە:**

**پەیبردن بە شتێك بە یەكێك لە هەستەكان.**

**زانین بە شێوەیەكی گشتی.**

**پەی بردن بە شتێكی سادە (البسیط)، سا ئەو پەی پێبردنە تەسەوری چییەتی (ماهیە) بێت، یاخود ڕاستاندن (تصدیق)ی[*] دۆخ و حاڵەتەكانی بێت.**

**هەربۆیە دەوترێت (عرفتُ اللهَ دون علمتُهُ) واتە: خودام ناسی نەك زانیم[١].**

**شەریفی جورجانی– یش لە كتێبی (التعریفات)دا دەڵێ: مەعریفە واتە: زانینی شت بەو شێوەیەی كە هەیە، واتە لەسەر حەقیقەتی خۆی، زانستیش بەهەمان شێوە، بە جیاوازی ئەوەی كە مەعریفە دوای نەزانین (الجهل) دێت، پێچەوانەی زانست، بۆیە خودای گەورە بە زانا (العالم)**

[*] زانین و پەیبردن بە شتێك یان بە چییەتی ئەو شتە بەبێ حوكمدان لە سەری بە ئەرێنی یان نەرێنی ئەوە تەسەورە، بەڵام كە حوكمی بە سەرا درا دەبێتە تەسدیق.

[1] د. عبدالمنعم الحفني – المعجم الشامل لمصطلحات الفلسفة، ط٣، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٠، ل ٨١٤–٨١٥.

ناودەبرێ نەك بەزانیار (العارف)[1]، چونکە زانینی خودا نەزانین یا نەبوون (العدم)ی لێ پێشنەکەوتووە و قابیلی لا چوون نییە.

ئیبن قەییم–یش لەجیاوازی کردنی لە نێوان چەمك و مانای هەریەکە لە مەعریفەو زانست دا، مەعریفەی بە تەسەور (تصور) و زانستی بە ڕاستاندن (تصدیق) داناوە.

## ٢ـ زانست:

زاناکان لە پێناسەی زانستدا جیاوازیان هەیە، هەندێك پێیان وایە تاریف ناکرێت وەکو فەخری رازی و ئەبولمەعالی جوەینی و ئەبوحامیدی غەزالی[2].

بەڵام زۆرینەی زانایان پێیان وایە دەکرێ زانست پێناسە بکرێت، بۆیە ئەبوبەکری باقلانی و ئەبولوەلیدی باجی وا پێناسەیان کردووە کە بریتییە لە (معرفة المعلوم علي ما هو به)، واتا: زانینی زانراو بەو شێوەیەی بوونی هەیە.

قازی (عبدالجبار الهمذاني)یش زانست بەوە پێناسە دەکات کە ئەو واتایەیە دەروونی زانا پێی ئۆقرە دەگرێت و ئاسوودە دەبێت[3].

---

[1] د. عبدالرحمن بن زيد الزنيدي– مصادرالمعرفة في الفكر الديني والفلسفي، مكتبة المؤيد، الرياض، ١٤١٢هـ–١٩٩٢م، ل٤٣.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥–٤٦.

لە فەلسەفەی هاوچەرخیشدا زانست وەکو فەیلەسوفی فەڕەنسی (ئۆجست کۆنت) دەیناسێنێت، ئاوا پێناسەکراوە کە بریتییە لە (زانینی یاسا راستەقینەکانی دیاردە سروشتییەکان و، جگە لە رێگەی ئەزموونیش رێگەی تری نییە).

(ئەمیل پاترۆ)ش دەڵێ (مەبەست لە زانست لەم رۆژگارەدا بریتییە لە: کۆمەڵێك زانیاری کە مرۆڤ بەدەستی هێناون).[1]

کەوابوو لای ئەوان زانست تەنیا لە بواری ئەزموون و جیهانی بەرهەستدا کورت دەبێتەوە، ئەم دیاریکردنەش بۆ چەمکی زانست لە رێبازی ئەزوموونگەرایی فەلسەفیی هاوچەرخەوە سەرچاوەی گرتووە کە خۆی لەچەند ئاراستەیەکی فەلسەفی دا دەبینێتەوە کە دیارترینیان ئاراستەی وەزعی و ئاراستەی مارکسی یە لە تیۆری مەعریفەدا.

ئەم چەمکەش کە زانست تەنیا لە بواری ئەزموون و جیهانی بەرهەستدا کورت دەکاتەوە، واتە نکوڵی کردن لە هەر شتێك نەکەوێتە چوارچێوەی ئەزموونی هەستەکانەوە، لە جیهانی ئەودیوی سروشت و هەموو ئەو شتانەی سەرچاوەیان سروش (وحی) بێت، یاخود ئەو زانستانەی لە هەست و شعوری ئاکاری سەرچاوە دەگرن.

ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ چەمکی زانست لە ئیسلامدا کە هەموو زانستە مرۆڤایەتییەکان چ ئەوانەی سەرچاوەیان عەقڵە – وەکو ماتماتیك–، یان هەست و ئەزموون، وێڕای عەقڵ – وەکو زانستی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧.

پزیشکی –، یاخود ئەوانەی سەرچاوەیان نەقلْ و گویْ لێبوونە – وەکو زمان، یان سروش و نەقلْە – وەکو زانستەکانی ئایین.

ئیبن تەیمییە دەڵیْ: (هەندیْ جار مەبەست بە زانست ئەو وتە و فەرمایشانەیە لە پێغەمبەرەوە هاتوون و وەرگیراون، چونکە ئیسپات بووە کە ئەو زانیویەتی بە بەڵگەی ئایەتی (فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ..)[1]. واتە: جا پاش ئەو زانست و زانینی و ئایەتانەی بۆت هاتووە هەرکەس لە بارەیەوە دەمەقاڵیْ و موجادەلەت لەگەڵدا بکات..

## مەعریفە و زانست لە زاراوەی قورئاندا:

وشەی (مەعریفە) لە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە، بەڵام وشەگەلی تر کە لەو ماددەیەوە سەرچاوەیان گرتووە زۆرن، لە وانە:

– بە دارِشتە (صیغە)ی رابردوو هاتووە، وەکو دەفەرمویْت: (تَرَي أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ )[2]. واتە: ئەبینی چاویان پڕ ئەبیْ لە فرمێسك و سەرڕێژ دەکات لەبەر ئەو راستییەی زانییان و بۆیان دەرکەوت.

---

[1] سورِەتی ئالی عیمرِان، ئایەتی (٦١). برِوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧–٤٨.
[2] سورِەتی مائیدە، ئایەتی (٨٣).

- به دارشتەی کرداری رانەبردوو (المضارع) هاتووە، وەکو دەفەرمویت: (يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنْكِرُونَهَا)[1]. واتە: نیعمەت و بەخششەکانی خودا دەزانن و لەگەڵ ئەوەشدا پاشان نکوڵی لێ دەکەن.

راغیبی ئەسفەهانی (حسێن کوڕی محمد، ساڵی ٥٠٢ك کۆچی دوایی کردووە)، دەڵێ: مانای مەعریفە لەم دوو ئایەتەدا واتە:( زانینی شت بە تێڕامان و لێوردبوونەوەی شوێنەوارەکەی)[2].

هەروەها بە دارشتەی (عرَّف)ش لە قورئاندا هاتووە کە بە مانای (بيّن و أعلَمَ) واتە رۆشنی کردەوە و پێی راگەیاند، هاتووە، وەکو دەفەرمویـت: (وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَي بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ)[3]. واتە: وەکاتێ پێغەمبەر قسەیەکی بە پەنامەکی بۆ یەکێ لە خێزانەکانی گێڕایەوە، جا کە ئەو خێزانەی پێغەمبەر ئەو قسەیەی گێڕایەوە بۆ کەسانێکی ترو خوایش پێغەمبەری ئاگادارکرد، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) هەندێ لەو قسە گێڕدراوانەی دیسانەوە بۆ ئەو خێزانەی گێڕایەوە و هەندێکیانی بۆ نەگێڕایەوە.

---

[1] سورەتی نەحل، ئایەتی (٨٣).

[2] الراغب الاصفهاني– معجم مفردات الفاظ القرآن ، تحقيق نديم مرعشلي، دار الكتاب العربي، ١٣٩٢هـ– ١٩٧٢م، ص ٣٤٣.

[3] سورەتی تەحریم، ئایەتی (٣).

هەروەك بە دارِشتەی (إعترف)ش بە مانای دانی پێدانا هاتووە: (وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ).[1] واتە: كۆمەڵێكی تر هەن لە دواكەوتووەكان (لە شەڕی تەبووك) كە دانیان نا بە تاوانی خۆیاندا.

وشەی (المعروف)یش لە قورئاندا هاتووە: (وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ)[2] كە بە مانای ئەو شتە دێت كە بە ئەقڵ یان بە یاسای شەرع زانراوە، واتە: ژنە تەڵاقدراوەكان بە پێی ئەو یاسا زانراوەو باوە مافی موتعەیان هەیە.

(العُرف)یش بە واتای (المعروف) هاتووە: (خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ).[3] واتە: كاری ئاسان لەسەر خەڵك داوا بكەو فەرمان بەو شتە بكە كە زانراوە بە چاكەو ئەقڵ و شەرع پەسندی دەكات.

كەوابوو (مەعریفە) لە قورئاندا ئەگەر بەشێوەی ئەو كردارەی لە مرۆڤ دەردەچێت هاتبوو، ئەوە مانای زانین و پەی بردن بە شتێك دەگەیەنێ بە ڕامان و لێوردبوونەوە لە شوێنەوارەكەی. ماناكانی تریش كە دەگەڕێنەوە سەر ئەسڵی مەعریفەو لە سەرەوە ئاماژەیان پێدرا، هەموویان بۆ ئەو واتایە دەگەڕێنەوە، بەڵام وشەی (عُرْفاً) لە ئایەتی (وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا)[4]، واتە: سوێند بەو فریشتانەی كۆمەڵ دوای كۆمەڵ و بە دوای یەكدا ئەنێردرێن بۆ جێبەجێكردنی فەرمانی خوا.

---

1 سورەتی تەوبە، ئایەتی (١٠٢).

2 سورەتی بەقەرە، ئایەتی (٢٤١).

3 سورەتی ئەعراف، ئایەتی (١٩٩).

4 سورەتی مورسەلات، ئایەتی (١).

دەگەڕێتەوە بۆ مانای زمانەوانی بەدوای یەکدا هاتن (التتابع) نەك زانین و پەی پێبردن[1].

بەڵام زانست (العلم): ئەویش بە چەندین داڕشتە هاتووە کە هەندێکیان پاڵ دەدرێنە لای خوداو هەندێکیان پاڵ دەدرێنە لای مرۆڤ.

ـ بە داڕشتەی کرداری رابردوو هاتووە، وەك خودا دەفەرموێت: (وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَي الرَّسُولِ وَإِلَي أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ).[2] واتە: ئەگەر ئەو کەسانەی ئەو دەنگوباسەیان بردبایە لای پێغەمبەرو لای کاربەدەست و تێگەیشتوانیان، ئەوا ئەو کەسانەی توانای لێکۆڵینەوەو هەڵهێنجانیان هەیە لەوان شتەکەیان دەزانی و دەیانزانی چۆن باسی دەکرێ و لە ئەنجامدا ئەوانیش تێدەگەیشتن.

ـ بە داڕشتەی کرداری رانەبردوو هاتووە کە خوای گەورە لە زمانی (عیسا)وە سلاوی خوای لەسەر بێت دەگێڕێتەوە: (تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ).[3] واتە: ئەوەی لە دەروونی مندایە تۆ دەیزانی، بەڵام من نازانم چی لای تۆیە.

ـ بە داڕشتەو سیغەی فەرمان (الامر)یش هاتووە: (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ).[4] واتە: جا تۆ بزانە و باوەڕت ببێ کە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە جگە لە خوا.

---

[1] راغیبی ئەسفەهانی– سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣١.

[2] سوڕەتی نیساء، ئایەتی (٨٣).

[3] سوڕەتی مائیدە، ئایەتی (١١٦).

[4] سوڕەتی محمد، ئایەتی (١٩).

ـ هەروەك بە دارشتەی چاوگ (المصدر)یش زۆر هاتووە لە قورئاندا، وەك دەفەرموێ: (هَا أَنْتُمْ هَؤُلَاءِ حَاجَجْتُمْ فِيمَا لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَاجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ).[1] واتە: ئەوە ئێوە بوون كە دەمەقاڵە و موجادەلەتان كرد لە هەندێ شتدا كە لە وانەیە ئێوە زانینتان پێی هەبێو شتێكی لێ بزانن، ئەی بۆچی لە شتێكدا كە هیچی لێ نازانن و زانستتان پێی نییە دەمەقالێ دەكەن؟

بەچەندین دارِشتەی تریش هاتووە، وەك فێری كرد (عَلَّمَ)، فێری دەكات (يُعَلِّمُ)، زانا (عالم)، زۆر زانا (عليم)، دەزانم (أعلم)، زانراو (معلوم)[2].

راغیبی ئەسفەهانی دەڵێ: مەبەست بە زانست (العلم) لە قورئاندا: زانین و درككردنی شتێكە بە شێوەی راستەقینەی خۆی، كە دوو جۆری هەیە:

**یەكەمیان: زانینی خودی شتەكەیە.**

دووەمیان: حوكمدان لە سەر شت بە بوونی شتێك كە بوونی هەیە بۆی، یان رەتكردنەوەی شتێك كە تیایدا نییە.

جا یەكەمیان تێپەڕەو پێویستی بە یەك (مەفعول) هەیە، وەك دەفەرموێت: (لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ)[3]. واتە: ئێوە نایانناسن و خودا دەیانناسێت.

---

[1] سورەتی ئالی عیمران، ئایەتی (٦٦).

[2] راغیبی ئەسفەهانی– سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٥٦– ٣٥٧.

[3] سورەتی ئەنفال، ئایەتی (٦٠).

دووەمیان تێپەڕە بۆ دوو (مەفعول)، وەك دەفەرموێت: (فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ)[١]. واتە: جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن.

لە بارەی جیاوازی نێوان زانست و مەعریفەش راغیبی ئەسفەهانی بەم شێوەیە روونی دەکاتەوە: (مەعریفە تایبەتترە لە زانست، چونکە دەگوترێت (فلان یعرفُ اللهَ، ولا یقال یعلمُ اللهَ)، واتە فلاّن کەس خودای ناسی و ناگوترێ خودای زانی، کە تێپەڕە بۆ لای یەك مەفعول و، زانینی مرۆڤ بە تێفکرینە و ڕامانە لە شوێنەواری خودا و نیشانەکانی، نەك پەی بردن بە زاتی خودا، بۆ خوداش دەگوترێ: الله یعلمُ کذا، ولا یقال یعرِفُ کذا، واتە: خودا فلاّن شتە دەزانێ و ناگوترێ فلاّن شتە دەناسێ. واتە مەعریفە لە زانستێکی ناتەواودا بە کاردەهێنرێت کە بە هۆی تێڕامان و بیرکردنەوەوە پێی دەگەیت)[٢].

دکتۆر (عبدالرحمن الزنیدی) لە کتێبی (مصادر المعرفة)[٣] دا دوای ئاماژەکردن بە وتەی ئیبن قەییم (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر، قوتابی ئیبن تەیمییە) لە بارەی جیاوازی نێوان مەعریفەو زانست لە قورئاندا دەست پێدەکات کە دابەشی کردووە بۆ جیاوازی واژەیی (لفظي) کە کرداری مەعریفە پێویستی بە یەك (مەفعول) هەیە، بەڵام کرداری زانست پێویستی بە دوو (مەفعول) هەیە، واتە ئەگەر کردارەکە دوو (مەفعول)ی

[1] سورەتی مومتەحینە، ئایەتی (١٠).

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل (٣٣١).

[3] د. عبدالرحمن بن زید الزنیدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١–٤٢.

خواست وەك لە ئایەتی (فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ)[1]، واتە وشەكە مانای زانین (العلم) دەگەیەنێت، بەڵام گەر كردارەكە یەك (مەفعول)ی خواست وەك لە ئایەتی (وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ)[2]، ئەوا مانای ناسین دەگەیەنێت، وە جیاوازی مەعنەوی، كە ئەمەش لەوەدا خۆی دەنوێنێ كە مەعریفە پەیوەستە بە خودی شتەكە و زانست پەیوەستە بەحاڵ و بارودۆخی شتەكە، وەك دەڵێیت (عرفتُ أباك وعلمتُه صالحًا)، واتە باوكتم ناسی و زانیم پیاوێكی باشە، كەوابوو مەعریفە بریتییە لە ئامادەیی شتەكەو نموونە زانستییەی لە دەروونْدا، بەڵام زانست ئامادەیی دۆخ و حاڵ و سیفەتەكانی و نیسپەت دانیانە بۆ لای ئەو شتە.

كەواتە مەعریفە وەك تەسەور وایەو زانستیش وەك تەسدیق[3].

هەروەها مەعریفە بە زۆری وایە بۆ ئەو شتە دەبێ یان بەكاردێت كە لە دڵ پەنهانە دوای درككردنی، كە دركی پێكرد دەوترێ زانی، یاخود بۆ شتێ بە كاردێت كە بە چەند سیفەتێك وەسف كراوە كە لە خودی كەسەكەدا هەن، جا كە بینی و زانی ئەو كەسەیە بەو سیفەتانە وەسف كراوە، دەوترێت ناسی.

لە نموونەی یەكەم، ئایەتی: (فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُ مُنْكِرُونَ)[1]، واتە: یوسف ئەوانی ناسی، بەڵام ئەوان ئەمیان نەئەناسی.

---

[1] سورەتی مومتەحینە، ئایەتی (١٠).

[2] سورەتی ئەنفال، ئایەتی (٦٠).

[3] پێشتر مانای (تصور) و (تصدیق) مان كردووە.

لە نموونەی دووەمیش ئایەتی: (الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ)[٢]. واتە: زاناكانی ئەهلی كتێب ئەوانەی تەوڕاتمان پێدان موحەممەد (درودی خوای لە سەر بێت) زۆر باش دەناسن وەك چۆن كوڕەكانی خۆیان دەناسن، چونكە سیفەتەكانی لای ئەوان زانراوبوون، كە بینیان یەكسەر بە هۆیانەوە ناسیان هەر بۆیە دژە مەعریفە نكوڵی كردن و دژە زانست نەزانینە.

زونەیدی بەمە كۆتایی بە قسەكانی دێنێت كە دەڵێ: پوختەی قسە لە پەیوەست بە پەیوەندی نێوان زانست و مەعریفە لە قورئانی پیرۆزدا ئەوەیە كە زانست گشتگیرترو تایبەتترە لە مەعریفە، هەربۆیە خوای گەورە وەسفی خۆی بە زانست كردووە نەك بە مەعریفە كە بریتییە لە زانینێك یان ئیدراكێكی ناتەوان (قاصر) بە بەراورد بە زانست، رێگاكەشی تێفكرین و ژیربێژییە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانین باس لە راوبۆچوونی فەیلەسوفانی ئیسلام و ئەهلی سوننە و پێناسەكانیان بۆ مەعریفەو زانست بكەین، بەر لەوانیش مەعریفەو زانست لای موعتەزیلەكان تاوتوێ دەكەین[*].

---

[1] سوڕەتی یوسف، ئایەتی (٥٨).

[2] سوڕەتی بەقەڕە، ئایەتی (١٤٦).

[*] لە پۆلێنكردنی بابەتەكاندا زیاتر پشتمان بە ستووە بە كتێبەكەی د. راجیح كوردی كە لە پەراوێزی دواترا دەناسێنرێت.

## مەعریفەو زانست لای موعتەزیلەکان

موعتەزیلەکان جیاوازی ناکەن لە نێوان مەعریفەو زانست، بۆیە هەموو زانا (عالم)ێك لای ئەوان زانیار (عارف) و هەموو زانیارێکیش زانایەو هیچ جیاوازی نییە[1].

پێناسەی موعتەزیلەکان بۆ زانست کە لە سەر زمانی (قازی عبدالجبار) زانای موعتەزیلە دەربڕاوە، بەم شێوەیە کراوە: (بریتییە لەو مانایەی دەخوازێت دڵی زانا پێی ئۆقرە بگرێت و دڵنیا بێت لەوەی تاوتوێی کردووە، بۆیە بەهیچ شێوەیەك ئەو شتە بە زانست ناژمێردرێت ئەگەر مرۆڤ لێی دڵنیا نەبێت و باوەڕی پێی نەبێت، هەربۆیە ئەم جۆرە مانایە تایبەت نابێ بەو حوکمەوە تا نەبێتە باوەڕێك و باوەڕی پێی ببێت بەو شێوەیەی بە تایبەت راستینە (حقیقەت)ی هەیەو واقیعە بە حوکمەکەوە)[2].

هەردوو گەورە زانای موعتەزیلەش (أبو علي محمد الجُبّانيّ – لە ٣٠٣ك – ٩١٥ز کۆچی دوایی کردووە) و (أبو هاشم عبدالسلام الجُبّانيّ – لە ٣٢١ك – ٩٣٣ز کۆچی دوایی کردووە) جەخت لەوە دەکەنەوە کە زانست واتە (اعتقاد الشئ علي ما هو به)، یانی باوەڕبوون بە شتێك بەو شێوەیەی بوونی هەیە، کەوابوو ئەوانیش (علم) بە (اعتقاد) هەژمار دەکەن.

---

[1] د. راجع عبدالحميد الكردي– نظرية المعرفة بين القرآن والفلسفة، ط١، مكتبة المؤيد، الرياض، ١٤١٢هـ – ١٩٩٢م ، ص٣٦.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤.

بەڵام قازی عبدالجبار خۆی رەخنەی لە پێناسەی دوو زاناکەیان گرتووە و پێی وایە ئەمە (دوورە، چونکە شوێنکەوتوو (المقلد) دەشێ باوەڕی بە شتێك هەبێت وەك ئەوەی هەیەو لە هەمان کاتدا زانایش نەبێـت، بۆیە حاڵی ئەو کەسە وەك حاڵی گوماندارو شکدارە، لە لای زمانەوانییەکانیش ئەوە سەلماوە کە وەسفی (زانا)یان بەو شێوەیە کردووە، ئەگەر دڵنیابوو لەوەی دەیزانێت شك و گومان و دوولا دروستی (تجویز) رووی تێناکات[1].

ئەهلی سوننەش رەخنەیان لە هەردوو پێناسەکەی سەرەوە گرتووە کە موعتەزیلەکان زانست بە دڵنیایی دەروونی و باوەڕبوون بەشت بەو شێوەیەی کە هەیە تاریف دەکەن[2]:

١ـ دەڵێن: ئەم سنوورانە هەڵدەوەشێنەوە بە زانست و زانیاری بوون بە مەحاڵ زانینی شتە مەحاڵەکان، چونکە زانست بوون پێیان زانست بوون نییە بە هیچ شتێك، چونکە مەحاڵ شت نییە، لە گەڵ ئەوەشدا زانست پەیوەندداره بەوەی مەحاڵ مەحاڵە، گەرچی مەحاڵ شت نییە بە ڕێککەوتن (اتفاق)ی زانایان، چونکە لای موعتەزیلەکان شتی نەبوو ئەو کاتە دەبێتە شت کە بوونی دروست (جائز الوجود) بێ، وەکو کاکڵ (جوهر)و رووکەش (العرض)، بەڵام ئەوەی بوونی مەحاڵ بێت نابێت بە شت.

---

1 هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤.

2 بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥.

٢ـ  دیسان وتراوە: ئەگەر زانست بە دیاریکراوی باوەڕبوون بێت، ئەو کاتە دەبێ هەموو زانایەك باوەڕدار بێت لە کاتێکدا خودا زانایە بەڵام باوەڕدار (معتقد) نییە، کەوابوو دیاریکردنی زانست و هەژمارکردنی بە باوەڕبوون شتێکی پووچەو پێناسەکە کۆکەرەوەی مەرجەکان (جامع) نییە.

٣ـ  بەوەش ڕەخنەیان لێگیراوە کە باوەڕبوون (إعتقاد) رەگەزێکی جیاوازەو ناکرێ زانست لەو حساب  بکرێت، کەابوو پێناسەکە رێگر (مانع)یش نییە لە شتی تر، چونکە دەکرێ تەقلید بێتە نێویەوە، ئەگەر لە گەڵ واقیع هاوڕێك (مطابق) بێت.

هەروەك زانای موعتەزیلە (إبراهیم بن سيّار النَّظّام – لە ساڵی ٢٣١ك – ٨٤٥ ز کۆچی دوایی کردووە) پێناسەی زانستی بەوە کردووە کە بریتییە لە (جووڵەیەك لە نێو دڵ لە کاتی بوونی شتێك وەك چۆن بووە و ناسراوە).

ئەم پێناسەیەش دیسان بەر رەخنە کەوتووە لە لایەن قازی عبدالجبار لە موعتەزیلەکان و لە لایەن ئەهلی سوننەشەوە، چونکە پێیانوایە جووڵە (الحركة) ئەو شتەیە جەستە پێی لە بەرامبەر شوێنێکدا ئەبێت پاش ئەوەی لە شوێنی تردا بووە، زانستیش تایبەتە بە زیندوو نەك شوێن، ناشوترێت دڵ بە مەعریفە دەجووڵێت. هەروەك ئەم پێناسەیە کرداری لەگەڵ ویست (الإرادة) تیکەڵ کردووە لەگەڵ ئەوەدا کە رەگەزەکەیان لە یەك جیاوازە یان لە گەڵ ئەوەی کە لە رەگەزو وەسفدا لە یەك جیاوازن[1].

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥– ٣٦.

## مەعریفەو زانست لای فەیلەسوفانی ئیسلام و ئەهلی سوننە

### أ- مەعریفەو زانست لای فەیلەسوفانی ئیسلام:

لای فەیلەسوفانی ئیسلام مەعریفەو زانست و پێزانین (الإدراك) یەك مانایان هەیە، چونکە بریتین لە "بەدەستهاتنی وێنەی شتێك لە عەقلّدا"[1].

فاڕابی پێی وایە مەعریفە ئەوکاتە ئەبێت کە عەقلّ بە شتە ماددییەکان دەزانێت و پەییان پێدەبات لەو کاتەدا دەبنە شتی ماقوولّ و عەقلّ پەسندانە (معقول)، بەمەش بوونی ئەوشتانە لە عەقلّدا دلّنیایی پەیدا دەکات و ئەو بوونەی جیایە لە بوونە ماددییەکەی ئەمەش نایەتە دی و تەواو نابێت مەگەر بە گواستنەوەی ئەو پێزانینە لە هێزو توانا (القوة) بۆ کردار (الفعل)[2].

ئیخوان سەفا[3] ش پێناسەی زانست دەکەن و دەلّێن: "زانست وێنەی زانراوە لە ناخی زانادا"[1].

---

[1] الجرجاني – السيد الشريف على بن محمد الجرجاني – التعريفات، ط ٢، انتشارات ناصر خسرو، طهران، ١٣٦٦هـ ش، ص٦٧.

[2] أ. د. على حسين الجابري – دروس فى الفكر الفلسفى الاسلامى، دار الغرقد للطباعة والنشر والتوزيع، ص٩٣.

[3] ئیخوان سەفا (اخوان الصفا) كۆمەلّێك كەس بوون لە بەسرە هاوچەرخی سەردەمی فاڕابی بوون لە نیوەی یەكەمی سەدەی چواری كۆچی (سەدەی دەی زایینی) دەركەوتن، (٥١) پەیامیان لە فەلسەفەدا نووسی، دەیانەویست سازان لە نێوان فەلسەفەو شەریعەتدا بكەن. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٤. د. عبدالمنعم الحفني – سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣.

ئەبوبەکری ڕازی (٢٥١ – ٣١١ك/ ٨٦٥ – ٩٢٣ز) ڕەخنە لە پێناسەی مەعریفەو زانست دەگرێت بەوەی بریتی بن لە بەدەستهاتنی وێنەیەك لە دەروون و ناخدا کە هاوڕێك بێت بۆ شتە زانراوەکە بەم شێوەیە[٢]:

١ـ بێگومان بەکارهێنانی وشەی وێنە (الصورة) بۆ زانست بە شێوەی پێچەك (المجاز)ە، گەرنا ئەبوایە زانراو خودی وێنەکە بوایەو دەبوو شتەکەش نەبوایە بە زانراو مادام وێنەیە.

٢ـ لەو قسەیەدا کە بوترێ زانست بەدەستهێنانی وێنەیەکە هاوڕێك بێت لەگەڵ زانراوەکەدا، خولاو خول (دور) ڕوودەدات.

٣ـ ئەم هاوڕێکی (مطابقة)یە نایەتە دی لەو شتانەدا کە لە جیهانی دەرەوە (الخارج) بوونیان نەبێت هەروا لە مەسەلە ئیعتیباری و زەینییەکاندا.

٤ـ نەبوون (العدم) فام دەکرێت ئیدی ئەو هاوڕێکی (مطابقة)یە لە کوێ دایە؟

**ب ـ مەعریفە و زانست لای ئەهلی سوننە:**

پێناسەی زۆر کراون بۆ مەعریفە و زانست لای زانایانی ئەهلی سوننە گەرچی هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی زانست بریتییە لە باوەڕێکی تەواو هاوڕێك لەگەڵ واقیعدا. لە بەشی دووەمیشدا دێینە سەر پەیوەندی زانست بە مەعریفەوە لە ڕووی هاو واتابوون یان جیاواز

---

[1] أ. د. علی حسين الجابري – سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٩.

[2] د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧.

بوون، بۆیە لێرەدا بە پێویستی نازانین تاوتوێی بکەین، بەڵکو لێرەدا تەنیا چەند پێناسەیەکی زانست لای زانایانی ئەهلی سوننە باس دەکەین[1].

ئەشعەری (ئەبولحەسەن عەلی – ساڵی ٣٢٤ك/ ٩٣٦ز کۆچی دوایی کردووە) پێناسەی زانست دەکات و دەڵێ زانست: ((ئەوەیە کە شتی پێ‌دەزانرێت. هەندێ جاریش دەڵێ: ئەوەیە کە کەسەکە پێی دەبێ بە زانا)).

رەخنە لەو پێناسەیەی ئەشعەری گیراوە بەوەی زاناو زانراو بە زانستەکان نەبێ ناناسرێن، ئیدی پێناسەکردنی زانست بەو دوانە خولاو خول (دَوْر)ی لێ دەکەوێتــەوە، بەڵام پێشەوا رازی وەڵامی ئەم رەخنەیەی بەم شێوەیە داوەتەوە: زاناو ئاگادار بوونی مرۆڤ بەوەی زانایەو هەستکردنی بە چێژو ئازار و نارەحەتییەکانی زانستێکی زەرورییە، زاناو ئاگادار بوونی بەوەی زانایە بەو شتانە، زانست و زانینە بە بنچینە (أصل)ی زانست، چونکە چییەتی (الماهية) لە نێو چییەتی کۆتدار (المقيدة) دایە، بۆیە زانستبوونی و ئاگاداربوونی بەوەی زانستە، زانستێکی زەرورییە، کەوابوو خولدان یان خولاو خول (دور) نامێنێت.

[1] بۆ ئەم پێناسانە بگەڕێوە بۆ : د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧ – ٤٣.

پێشەوا حەرەمەینی جوەینی (أبو المعالی عبدالملك الجوینی – ساڵی ٤٧٨ ك/ ١٠٨٥ز كۆچی دوایی كردووە) پێناسەی زانستی كردووە بەوەی ((رێگا بۆ وێناكردنی چییەتی زانست و جیاكردنەوەی لە غەیری خۆی ئەوەیە بڵێین: ئێمە لە ناخی خۆماندا بەڵگەنەویستانە دەزانین كە خۆمان باوەڕمان بە هەندێ شت هەیە، جا دەڵێین: باوەڕبوونمان بە شتێك كۆتاییە یان نا، گەر كۆتاو بڕاوە بوو یان هاوڕێك (مطابق)ە یان نا، جا گەر هاوڕێك بوو یا ئەوەتە لە بەر ئەرێكار (موجب)ێكە كە خودی دوولای مەوزوع و مەحمول (موضوع) و (محمول)ە كە ئەویش بریتییە لە زانست، یان لە بەر ئەرێكارێكە كە باوەڕبوونی شوێنكەوتوو (مقلد)ە، بەڵام ئەگەر ئەو باوەڕە كۆتا و بڕاوەیە بوو كە ناهاوڕێكە ئەوە نەزانین (الجهل)ە.

ئەوەیش كە كۆتاو بڕاوە نییە: یان هەردوو لای یەكسانن كە پێی دەوترێت دوودڵی یان شك، یان لایەكیان راستتر (راجح)ە لەوی تر، جا ڕاسترەكە دەبێتـە گومان (ظن) ناڕاستتر (مرجوح)ەكەش دەبێتە وڕێنە و خەیاڵپڵاو (وهم).

پێشەوا ڕازی رەخنەی لەم پێناسەیە گرتووەو لە چەند ڕوویەكەوە بە ناتەواو لە قەڵەمی داوە:

١ـ وەختێك ئەم پێناسەیە تەواوە كە بڵێین زانینمان بە چییەتی باوەڕبوون زانستێكی بەڵگەنەویستانە (بدیهی)یە. ئەگەر ئەوە دروست بێت، ئیتر بۆچی بانگەشەی ئەوە دەكەین كە زانینمان بە چییەتی زانست شتێكی بەڵگەنەویستە؟

٢ـ ئەم پێناسەیە بۆ زانست بە نەبوونی دژەکانیەتی، خۆ ناسینی دژەکانیش بەهێزتر نییە لە ناسینی زانست تاوەکو نەبوونی دژ بکرێتە پێناسی دژەکە، کەوابوو کارەکە دواجار دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پێناسەی شت بە شتی وەك خۆی یان تایبەتتر لەو بە ئەنجام بگات.

٣ـ زانست هەندێ جار وێناکردن (تصور) و هەندێ جاریش ڕاستاندن (تصدیق)ە، ئەویش نە باوەڕی یەکلاکەرەوە نە گومان رووی تێناکات، هەروەها هێزو لاوازیش رووی تێناکات، جا گەر وابوو زانستە تەسەورییەکان لە پێناسەکە دەردەچن و بەمەش پێناسەکە کۆکەرەوە (جامع) نابێت.

قازی باقلانی (أبوبکر محمد الباقلانی ساڵی ٤٠٣ك/١٠١٣ ز کۆچی دوایی کردووە) پێناسەی زانست دەکات و دەڵێ: بریتییە لە ((زانینی زانراو (المعلوم) بەو شێوەیەی هەیەو لە ئارادایە یان لەسەر ئەو حاڵەتەی پێیەوە وەستاوە، وەك بڵێی وتوویەتی ئەوە مەعریفەیە)).

ئەم پێناسەیەش لە چەند رووییەکەوە بەر رەخنە کەوتووە:

١ـ پێناسەکە خولدانەوە (دَوْر)ی تیایە، چونکە پێناسەی زانست بە زانراو کراوە. خۆ مەعریفە بە پێی زانراو نەبێ نابێت، یان زانراو لە زانست وەرگیراوە، بۆیە پاش ناسینی نەبێ نازانرێت.

٢ـ پێناسەکە پێناسەی شتێکە بە خودی خۆی، ئەمەش مەحاڵە. لەبەر ئەوەی دەڵێت زانست خودی مەعریفەیە.

٣ـ مەعریفە لە روانگەی ئەهلی سوننەوە بەدەستهاتنی زانست و زانینە دوای لێڵی و ناڕوونی، بۆیە دەوترێت: ما کنتُ اعرفُ فلاناً والآن

عرفتُه، واته: من پێشتر فلانم نەدەناسی و ئێستا دەیناسم. ئەم پێناسەیە زانستی خودای گەورەی لێ دەردەچێت لە کاتێدا داننراوە بەوەی خودا زانستی هەیەو، زانستی خوداش بە مەعریفە ناو نابردرێت.

پێناسەی زانست لای ئیسفەڕاییینی (عصام الدين إبراهيم الإسفراييني ١٤٦٨ – ١٥٤٤م) بەم شێوەیەیە: ((ڕۆشنکردنەوەی شتی زانراو. وەك ئەوەی بڵێیت: زانست روونکردنەوەی راستییەکانە. یان هەر بە کورتی دەڵێ زانست روونکردنەوە – تبیین –ە)).

رازی پێناسەکەی بە لاواز لە قەڵەم داوە، چونکە روونکردنەوە شتێك نییە جگە لە گۆڕینی وشەیەك بە یەکێکی تر کە لەو پەنهانترو ناڕۆشنتر بێت. روونکردنەوەو رۆشنکردنەوەش ئاشکرابوون و دەرکەوتنی شتێك دەگەیەنن دوای پەنهان بوونی، ئەمەش دەربارەی زانستی خودا روونادات و ڕەوا نییە.

بەڵام ئیبن فۆڕەك (أبوبكر محمد بن فورَك – لە ساڵی ٤٠٦ك/ ١٠١٥ز کۆچی دوایی کردووە) بەم شێوەیە پێناسەی زانستی کردووە کە بریتییە: ((لەو شتەی باش ئەنجامدانی کار لەو کەسەی پێی وەسف دەکرێت دروست و سەحیحە)).

ئەم پێناسەیەش دیسان بە لاواز لە قەڵەم دراوە، چونکە بوونی زانین و زانست بە واجبوونی شتە واجبەکان و پێشگیری لە قەدەغەکراوەکان ئەوە ناگەیەنێت ئەمانە بە باشی ئەنجامبدرێن.

بەغدادی (عبدالقاهر بن الطاهر البغدادي) لە ئەشعەرییەکانەوە ئەم پێناسەیە دەگوازێتەوە کە زانست: ((سیفەتێکە کەسی زیندوو پێی دەبێت بە زانا)).

جورجانی چەند پێناسەیەکی تریش باس دەکات، لەوانە: وتراوە: زانست سیفەتێکی جێگرتووە شتە هەمەکی (کلیات) و هەندەکی (جزئیات)ەکانی پێ دەزانرێن. وە وتراوە: زانست بریتییە لە گەیشتنی دەروون بە مانای شتەکە..[1]

## پێناسەی غەزالی بۆ مەعریفەو زانست

غەزالی زانست دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕۆشنایی دەروونی و بۆ حەقیقەتی شتەکان و، بەدەسهاتنی وێنەی خودی راستیەکان لەنێو دڵدا، بۆیە زانست لای غەزالی بریتییە لە بەدەستهاتنی وێنەی حەقیقەتی شتەکان، چونکە بۆ هەر زانراوێك حەقیقەتێکی زانراو هەیە، ئەو حەقیقەتەش وێنەیەکی هەیە کە لە ئاوێنەی دڵدا چاپ دەبێت و تیایدا ڕۆشن دەبێت.

پێناسەی مەعریفەش بەوە دەکات کە بریتییە ((لەو زانستەی گومان هەڵناگرێت – ئەگەر زانراوەکە زاتی خودای گەورەو سیفەتەکانی بێت))، وە بریتییە لە ((نەخشگرتنی دەروون بە وێنەی زانا تاوای لێدێت ئەویش وەکو زاناکە دەبێت بە زانا))[2].

---

[1] السید الشریف الجرجانی – التعریفات – سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٧.

[2] بڕوانە: د. راجح عبد الحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٠.

پێشەوا رازی رەخنەی لەو پێناسەیە گرتووە کە زانست و مەعریفە بە نەخشگرتنی دەروون یان نەفس بە وێنەی شتەکان تاریف بکرێن، چونکە ئەگەر بینین بریتی بێت لە خودی هەست و وێناکردنەکە، ئەوا ئێمە نەمان ئەبینی مەگەر بە ئەندازەی خاڵی بینین چونکە وێناکردنی گەورە لە بچووکدا مەحاڵە و، ئێمەیش بینراو دەبینین وەك ئەوەی هەیە، خۆ گەر بینراوەکە هەمان ئەو وێنە وێناکراوە بێت لە دەرووندا، نەمان ئەبینی لە شوێنی خۆیدا[1].

دکتۆر راجیح کوردی پێناسەکانی غەزالی بۆ زانست بە سەرکەوتوو دەبینێ، چونکە دەڵێ بەدەستهاتنی زانست سێ شتی گەرەکە[2]: یەك دڵ یان عەقڵ یان ئەو تایبەتمەندییەی لە مرۆڤی درككار (المدرك)دا هەیەو شتی پێ دەزانێ و مرۆڤی پێ لە زیندەوەرو گیانلەبەرانی تر جیا دەکرێتەوە. دوو: حەقیقەتی شتە زانراوەکان، چونکە بە بوونی ئەوان واقیعیەتی مەعریفە دێتـەدی. سێ: چۆنیەتی بەدەستهاتنی زانست و زانیارییە بە حەقیقەتی شتەکان بۆ کەسی زانیار.

مرۆڤیش ناتوانێ زانست و زانیاری بە هەموو شتەکان لەم بوونەوەرەدا هەبێت، بۆیە زانینەکەی بریتییە لە وێناکردنی وێنەی هەندێ لەم بەدیهێنراوانە لە دەروونی زانیارەکەدا.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٠ – ٤١.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١.

پێناسەی غەزالی بۆ مەعریفە بەوەی ئەو زانینەیە کە گومان و شك هەڵناگرێت ئەگەر زانراوەکە یان ئەوەی زانین پەیوەندی پێیەوە هەیە زاتی خوای گەورە و سیفەتەکانی بن، بەڵگەیە لە سەر ئەوەی مەعریفە لای ئەو تایبەتترە لە زانست، چونکە ئەو بە زانین و زانستی دڵنیایی (العلم اليقين) لە قەڵەمی داوە.

بەڵام مەعریفەی راستەقینە یاخود زانینی دڵنیایی کە غەزالی دەیخوازێت، بریتییە لەو مەعریفەیەی بەم قۆناغانەدا تێپەڕدەبێت[1]:

١- قۆناغی دوودڵی (مرحلة الشك): لەم قۆناغەدا عەقڵ دوودڵ دەمێنێت و ناتوانێ نە پێش بکەوێت و نە پاش بکەوێت بە سەلماندن یاخود رەتکردنەوە، واتە هەردوو لای تێدا یەکسانە.

٢- قۆناغی گومان (مرحلة الظن): تیایدا عەقڵ دەجووڵێ بەرەو سەلماندن و بەدروست زانینی لایەك بە بێ بنبڕکردن، یان دەروون بۆ یەك لەو دووشتە دەڕوات لەگەڵ هەستکردن بە گونجانی پێچەوانە یان بەرامبەرەکەی، بەڵام ئەم گونجانە ڕێگە لەوە ناگرێت یەکەم لە دووەم بە راستتر دابنێین.

٣- قۆناغی باوەڕپێکردن (مرحلة الإعتقاد): ئەمەش بەوە دەبێت کە گومان بگاتە ئاستی متمانەو بنبڕ و سەلماندن، بەڵام هێشتا زانین و مەعریفەکە تیایدا تەواو نییە. دەروون لەم قۆناغەیدا بۆ راستاندن

---

[1] الغزالي: محمد بن محمد الغزالي أبو حامد – إحياْء علوم الدين، ج١، دار المعرفة، بيروت، ل ٧٢ – ٧٣.

(تصديق)ی شتێك دەڕوات بەشێوەیەك ئەوەیان زاڵ ئەبێ بە سەریاو هیچی تری بە خەیاڵدا نایەت، خۆ گەر بە خەیاڵیشی دا بێت دەروون قبوڵی ناکات، بەڵام هێشتا زانینێکی تەواو نییە، بەڵکو ئەمە باوەڕبوونێکە نزیکە لە دڵنیایی و یەقین.

٤- قۆناغی دڵنیایی و زانینی راستەقینە (مرحلة المعرفة الحقيقية): کە بە بەڵگەو دەلیلێك بەدەست دێت کە نە دوودڵی تێدایە و نە ڕێی شك و دوو دڵیشی تێدەچێت، جا ئەگەر بوونی شك و دوودڵی رێی تێنەچێت و دروست نەبێـت، ئەو کاتە پێی دەوترێت دڵنیایی و یەقین.

## پێناسەی ڕازی بۆ زانست:

پێشەوا ڕازی بە هیچ کام لەم پێناسانەی لەلایەن موعتەزیلەکان و فەیلەسوفان و ئەهلی سوننەوە بۆ زانست کراون قایل نییە و رەخنەی ئاراستەی هەموویان کردووە. ئەو پێی وایە هەر لە بنەڕەتدا زانست پێویستی بە پێناسەکردن نییە، بەڵکو پێناسە کردن ماف خۆی پێنادات، چونکە زانست لە دڵ و دەروونی ئێمە و لای ئێمە —بە باوەڕی ڕازی— لەوە رۆشنترە پێناسە بکرێت.

لەو بارەوە، ڕازی دەڵێت: ((کاتێ سەلما کە ئەو پێناسانەی خەڵکان باسیان کردوون پووچەڵ (باطل)ن، ئەوە بزانە کە دەستە پاچەیی لە پێناسەکردن لەوانەیە بەهۆی زۆر پەنهانی و شاراوەیی خوازراوەکە بێـت، لەوانەشە بەهۆی ئەوەوە بێـت کە لە بەرگەیشتنی لە رۆشنی و

دیاربووندا بە حاڵەتێك شتێك لەو ناسراوتر نەبێت تا پێناسە بکرێت. دەستەپاچە بوون و بێ توانابیش لە پێناسەکردنی زانستدا لەم بابەتەیە. لە ڕاستیدا هەریەکە لە ئێمە بەبێ پێچ و پەنا و چەندوچوون دەزانێت کە خۆی بوونی خۆی دەزانێت و ئەوەش دەزانێ کە نە لە ئاسمانە و نە لە قووڵایی دەریادا، ئێ خۆ بوونی ئەو زانینە بێ پێچ و پەناو بەڵگەنەویستە بەوەی خۆی زانایە بەم شتانە، زانین و زانستە بەوەی خۆی بەو زانستانە وەسف دەکرێت، ئەو کەسەیش زانابێ بە پاڵدان و نیسپەت دانی شتێك بۆ لای شتێکی تر زانایشە بە هەردوو لایەنەکەی، جا وەختێك زانینی بەڵگە نەویستانە بەم نیسبەت دانە بەدەستهات، ئەوا زانستی بەڵگەنەویستانە (الضروري)یش بە چییەتی زانست بە دەستهاتووە، جا گەر حاڵ ئاوابێ پێناسەکردنی ملی بۆ نادرێت و ناشێت و نابێت))[1].

بەپێی ئەم پێناسانەی ئەهلی سوننە دەبینین ئەوان زانست لە باوەڕێکی بنبڕی هاوڕێك (مطابق)ی واقیع یان ئەوەی بە دڵنیایی و یەقین دەچێت کورت دەکەنەوە، هەروەها پێیان وایە ئەمە بڕیارو حوکمێکی بنبڕ (جازم)ە و شك و دوودڵی قبوڵ ناکات، لەکاتێکدا زانست لای موعتەزیلەکان بە مانای باوەڕبوون شك و دوودڵی قبوڵ دەکات.

---

[1] د. راجح عبدالحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣ – ٤٤.

کورت و پوخت ئەوەیە، کە زانست لەوە رۆشنترە کە پێناسە بکرێت، لەو رووەوە کە مرۆڤ هەست بەخۆی دەکات کە دەزانێت، هەر پێناسەیەکیش کە کراوە بۆ زانست قابیلی رەخنە لێگرتنە، مەسەلەکەش لە هەموو ئەمانە ساناترە – وەك د. راجیح کوردی دەیلێت[1] – و ئێمەیش پشتگیری دەکەین، چونکە هەر هەوڵێك بۆ پێناسەکردنی زانست هەوڵێکی ناتەواوە، چونکە پێناسەیە بۆ زانست لە روویەکەوەو لە رووێکی ترنا، ئەوەی کە پێناسەی بە ئۆقرەیی و دڵنیایی دەروون کردووە مەبەستی ئەوە بووە کە زانست ئەو پلە یەقینییەیە کە دەروونی مرۆڤ بەبێ هیچ شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوە یان باوەڕێکی خودان شك و دوو دڵی پێی بگات. هەیشە وای پێناسە کردووە کە ببێتە سیفەتی کەسی زیندوو، ئەوەی تر تاریفەکەی وا کردووە کە دەیگەڕێنێتەوە بۆ بارێکی ناوخۆیی یان دەروونی وەکو پێناسەکردنی زانست بە وێناکردن یان نەخشی شت لە دەروونی مرۆڤدا. بە هەرحاڵ ئەم هەوڵانە بۆ پێناسەکردنی زانست، هەوڵگەلێکن بۆ پێناسە کردنی شتێکی رۆشن لە دەروونی مرۆڤدا کە هەستی پێدەکات، وەك خەسڵەتێك یان بەهرەیەك کە خوای گەورە پێی بەخشیوە و بە هۆیەوە رێزی لێناوە، بەڵکو خوای گەورە بە هۆی زانستەوە یەکەم مرۆڤی کە (ئادەم)ە سڵاوی خوای لە سەر بێت، بە سەر فریشتەکاندا بەرز

---

[1] د. راجح عبدالحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥ – ٤٦.

کردەوەو ڕێزی زیاتری پێدا، وەك دەفەرموێت: (وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا).[1] واتە: وە خوا ناوی هەموو شتەکانی فێری ئادەم کردو تێی گەیاند.

(اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥))[2]. واتە: بخوێنەو پەروەردگاری تۆ لە هەموو بەخشندەیەك بەخشندە ترە، ئەو پەروەردگارەی فێری کردووە بە هۆی قەڵەمەوە، مرۆڤی فێری ئەو شتانە کردووە کە پێشتر نەیزانیون.

---

[1] سوڕەتی بەقەڕە، ئایەتی (٣١).

[2] سوڕەتی عەلەق، ئایەتەکانی( ٣ — ٥).

لەم بەشەدا سەرەتا تیشکێك دەخەینە سەر مێژووی پەیدابوونی تیۆری مەعریفە، وە ئایا تیۆری مەعریفە چییە؟ پاشان باس لە پەیوەندی نێوان زانست و مەعریفە دەکەین لە دیدگای موعتەزیلەکان و ئەهلی سوننەوە.

## مێژووی سەرهەڵدانی تیۆری مەعریفە:

تیۆری مەعریفە لە بوار و گۆڕەپانە بنەڕەتییەکانی توێژینەوەی فەلسەڤ دێتە هەژمار، ئەم تیۆرە زۆر کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی توێژینەوە و تێفکرین لەباس و خواسەکانی سروشت و مرۆڤ و ئەودیوی ئەو دوانە بۆ گەڕان بەدوای ڕاستییەکان و گەیشتن بە حەقیقەت خراونەتە گەڕ، بۆ نموونە کاتێ باس لە فەلسەفەی یۆنانی دەکرێت، سوقڕات لە سەروویانە ناوی دێت (ساڵی ٣٩٩ پ.ز کۆچی دوایی کردووە) کە کاکڵی فەلسەفەکەی بریتی بووە لە: (خۆت بە خۆت بناسە)، زانین و مەعریفەی بە چاکخوازی (الفضيلة) و نەزانینی بە بەدخوازی (الرذيلة) لە قەڵەم داوە.[1]

سوقڕات عەقڵی بە سەرچاوەی مەعریفە داناوە، دوای ئەویش قوتابییەکەی ئەفلاتوون (ساڵی ٣٤٧ پ.ز کۆچی دوایی کردووە) درێژە بە ڕێبازی مامۆستاکەی دەدات و بیرکردنەوەی ئاقڵانە دەکاتە پێوەری ڕاستەقینە و ڕاست و تەواو، بە پێچەوانەی مەعریفەی هەستیی

[1] د. عبدالرحمن بن زيد الزنيدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢.

فریودەرانە،[1] چونکە پێی وایە هەستەکان (الحواس) ناتوانن پەی بە مانا رووتەکانی وەك دادپەروەری، چاکخوازی، ئازادی و یەکسانی، جوانی، ببات.[2]

دوای ئەفلاتوون قوتابییەکەی ئەرستۆ (٣٨٤ – ٣٢٢ پ.ز) هات، کە ئەویش پێی وا بووە عەقڵ لە توانایدایە بگات بە مەعریفە کە بریتییە لە حەقیقەت، ئەرستۆ لە رێبازی فەیلەسوفانی پێش خۆی کۆڵیوەتەوەو رەخنەشی لێگرتوون، وتوویەتی ئەوان هەندێ لە ڕاستییان دۆزیوەتەوە، بەڵام رێگەیان ون کردووە وەك (فیساغۆرس و ئەفلاتوون)[3].

توێژینەوەو لێکۆڵینەوە دەربارەی مەعریفە بەردەوامی هەبوو لە لایەن فەیلەسوفانی یۆنان و فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاستی مەسیحی و، فەیلەسوفانی ئیسلام، ئیتر بە پێی پێشکەوتنی سەردەم و جیهانبینی هەریەکەیان گۆڕان بە سەر پێناسەو بۆچوونەکانیان لە هەمبەر مەعریفەدا هاتووە، هەروەك دواتر تیشکی دەخەینە سەر.

دەمانەوێت ئەوە بڵێین کە فەلسەفەی هاوچەرخی خۆرئاوا پێی وایە تیۆری مەعریفە بەر لە ساڵی (١٦٩٠ز) سەری هەڵنەداوەو بوونی نەبووە کە لەو ساڵەدا کتێبەکەی (جۆن لۆك) بە ناوی (وتارێك لە زەینی مرۆڤدا

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣.

[2] عدنان سبیعي – الفلسفة من تأریخ الفكر الفلسفي، ط ١، دارالعصماء، دمشق، ١٤٣٣هـ – ٢٠١٢م ، ل ٥٨.

[3] بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٦.

– مقالة في الذهن البشري) چاپ كراوه، پێش ئەوكاتە باسكردن لە باس و بابەتگەلی ئەو تیۆرە، خۆی لە ئاماژەدان بەو مەسەلانەدا دەبینێتەوە كە فەیلەسوفە یۆنانیەكان هێناویانن، زۆربەی نووسەرو وەرگێڕەكانی عەرەبیش لە سەرهەمان ڕێڕەو ڕۆیشتوون بێ ئەوەی ئاماژە بە ڕۆڵی مسوڵمانان بدەن لەو ڕووەوە[1] مێژوونووسانی هزری فەیلەسوفانی مسوڵمانیش هاتوون راوبۆچوونەكانیان سەبارەت بە عەقڵ و نەقڵ و ئەو شتانە باس كردووەو، كاتیكیش لە بارەی فەلسەفەی ئیسلامییەوە دەنووسن، تەنیا باس لە بنەماكانی بیروباوەڕی ئیسلامیی و ئەو مەسەلە گەورانە دەكەن كە لەو سەردەمی دا وروژێنراون، وەك ناو و سیفەتەكانی خوداو قەزاو قەدەرو پێغەمبەرایەتی و پێشەوایەتی و تێڕوانینی كۆمەڵەكان (الفرق) كە پاڵ دەدرێنە لای ئیسلام. هەندێكی تریش لە لێكۆڵەرەوان بە ئاراستەی توێژینەوەی پرس و بابەتەكانی ئەم تیۆرەدا ڕۆیشتوون لە میانی دەقە شەرعییەكان و، ئیجتیهادی زانایانی پێشووی مسوڵمان لەو مەسەلانەدا.

بەڵام راستیەكەی ئەوەیە كە زانایانی پێشینی ئیسلام ڕۆڵی مەزنیان هەبووە و پشكی گەورەیان بەردەكەوێت لە بواری مەعریفە و پرس و بابەتەكانی و ئەمەش لە میانی كتێب و دانراوەكانیاندا بە تەواوی دەردەكەوێت، بۆ نموونە كاتێ زانستەكانی بنەماكانی ئایین (أصول الدین) و فیقهو لۆژیك (المنطق)یان تاوتوێ كردووە، هاتوون

[1] بڕوانە: د. عبدالرحمن بن زید الزنیدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦.

مەسەلەکانی تیۆری مەعریفەیان شەن و کەو کردووە، تەنانەت هەندێ لە زانایانی ئیسلام کتێبی تایبەتیان سەبارەت بە هەندێ مەسەلەی تیۆرەکە داناوە، بۆ نموونە (ئیبن تەیمییە) کتێبی (درء تعارض العقل والنقل)ی داناوە کە تیایدا باس لە پەیوەندی نێوان هەردوو سەرچاوەی مەعریفە (عەقڵ و سروش) و گۆڕەپانی هەریەکەیان و سنووریان دەکات[(١)].

هەروەها قازی (عبدالجبار) ی موعتەزیلە بەرگێکی تەواوی لە کتێبەکەی (المغني في أبواب التوحيد والعدل) لە ژێر ناونیشانی (النظر والمعارف) دا بۆ باس و خواسەکانی مەعریفە تەرخان کردووە.[(٢)]

قازی باقلانی – ش لە کتێبەکەیا (التمهيد) پێشەکی یەکی لە چوارچێوەی دەروازە (باب)ێدا سەبارەت بە زانست و بەشەکانی و ڕێگاکانی نووسیوە، کە دواتر زانایانی زانستی ئاخاوتن (الكلام) ڕێچکەی ئەویان گرت و کتێبەکانیان بە پێشەکی یەك دەست پێدەکرد کە وەکو تیۆرێك لە مەعریفە یان لێکۆڵینەوەیەك لە فەلسەفەی گشتی وابوو، لێرەدا تەنیا ئاماژە بە دوو نموونە دەکەین[(٣)]:

---

[1] لە : سەرچاوەی پێشووەوە، ل ٥٦ – ٥٧.

[2] د. حربي عباس عطيتو و د.موزة محمد عبيدان – مدخل إلى الفلسفة و مشكلاتها، ط١، دارالنهضة العربية، بيروت، ١٤٢٣ هـ – ٢٠٠٣م ، ل ١٥٠.

[3] د. عبدالرحمن بن زيد الزنيدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٨.

یەکەمیان: فەخرەددینی ڕازی، کە پایەی یەکەمی لە کتێبی (المحصل) بۆ زانست و تێڕامان تەرخان کردووە.

دووەمیان: ئیجی (عَضُدالدين الإيجي – ساڵی ٧٥٦ك – ١٣٥٥ ز کۆچی دوایی کردووە)، کە وێستگەی یەکەمی لە کتێبەکەی (المواقف) دا بۆ زانست و تێفکرین تەرخان کردووە.

## تیۆری مەعریفە چییە؟

لە ئەرکە هەرە لە پێشینەکانی ئیپستمۆلۆژیا بریتییە لە هەوڵدان بۆ پێناسەکردنی مەعریفە، بەڵام ئەوەی ئەو مەسەلەیە یان ئەو ئەرکەی قورس کردووە، گرفتی پێوەرەکانە کە پێویستە پەیڕەو بکرێن، یان لە بەرچاو بگیرێن، گریمان ئێمە دەستمان کرد بە پێناسەکردنی مەعریفە، بەوەی ئاماژە بکەین بەو حاڵەتانەی تیایاندا مەعریفە بەدەست دێنین پاشان شتە هاوبەشەکان لەو حاڵەتانەدا دیاری دەکەین، لێرەدا گرفتێك سەرهەڵدەدات کە ئاخۆ دەتوانین پێشوەختە حاڵەتەکانی مەعریفە دیاری بکەین بەوەش پێشوەختە پێوەرو ئاماژەکانی مەعریفە دەزانین، یاخود بە پێچەوانەوە رەنگە بتوانین بە سادەیی پێناسەی مەعریفە بکەین لە میانەی تێفکرین لە رەوشی مەعریفەو زانینی پێوەرەکانی مەعریفە، بەڵام گەر حاڵەتەکانی مەعریفە بە دیاری کراوی نەزانرێن چۆن پێوەرەکانی مەعریفە دیاری دەکرێن؟

لەم سۆنگەوە سەبارەت بە پێناسەکردنی مەعریفە راجیایی هەیە لە نێوان زاناو فەیلەسوفەکاندا، هەندێك وا پێناسەی مەعریفە دەکەن، کە

بریتییە لە پەیبردن یان (إدراك) بە شێوەیەکی گشتی ئیتر (تصور)ی بێت یان (تصدیق)، بۆیە وتراوە هەموو مەعریفە و زانستێك یان تەسەورییە یان تەسدیقە[1]. لەلایەکی تریشەوە بەپێی دابەشبوونی قوتابخانەکانی فیکری ئیسلامیی، جیاوازی بەرچاو دەکەوێت لە نێوان بڕیاردان سەبارەت بە پێناسەی هەریەکە لە مەعریفەو زانست و جیاوازی نێوانیان هەروەك پێشتر روونمانکردەوە.

هەندێکیش پێیان وایە چەمکی مەعریفە چەمکێکی بەڵگەنەویستەو نەك پێویست بە پێناسەکردنی ناکات، بەڵکو هەر ناکرێ پێناسە بکرێت، چونکە ئێمە کاتێ لە پێناسەی شتێك دەگەڕێین، واتا دەگەڕێین لە رۆشنکەرەوەیەك بەهۆیەوە بتوانین ئەو شتە خوازراوە تاریف بکەین، کەوابوو ئێمە پێشتر مانای مەعریفەمان زانیوە، وە ئەگەر پێویست بە روونکردنەوەیەك بۆ مانای وشەی (مەعریفە) بکات، باشترە بڵێین: ناسینی هەرشتێك بریتییە لە (ئامادەگی خودی ئەو شتە یان وێنە هەندەکی یەکەی (صورته الجزئیة) یان چەمکە هەمەکی یەکەی (مفهومه الكلي) لای هێزی درککار (القوة المدركة)، کەوابوو بۆ هاتنەکایەی مەعریفە پێویست نییە کە هەمیشە ئەو کەسەی شتەکە دەزانێ جیابێت لە زانراوەکە، بەڵکو لە هەندێ حاڵەتدا دەکرێ هیچ جیاوازییەك لە نێوان

---

[1] د. عبدالمنعم الحفني – المعجم الشامل لمصطلحات الفلسفة– سەرچاوەی پێشوو، ل ٨١٤.

زانیار و زانراودا نەبێت وەکو زانین و هەستکردنی نەفس بۆ خودی خۆی (أنا المدرك)[1].

ئەمە سەبارەت بە (مەعریفە)، لە لاپەڕەکانی پێشووشدا پتر لە سەر چەمك و پێناسەی مەعریفەو زانست وەستاین.. لێرەدا تیشك دەخەینە سەر پێناسەی (تیۆری مەعریفە)، بەڵام تیۆر (النظرية) بە مانای مەسەلەیەك دێت کە بە بەڵگە ئیسپات ببێت، لای فەیلەسوفانیش بریتییە لە پێکهاتەیەکی عەقڵی پێکهاتوو لە چەند تەسەورێکی هاو ئاهەنگ بە ئامانجی پەیوەستکردنی ئەنجامەکان بە بنەماکانەوە، هەروەك جار وایە مەبەست پێی ئەو وشەیەیە کە هاوواتای سیستەم (النسق)ەکەیە، واتە بە کۆی شتە بەڵگەدارو سەلمێنراوەکان دەوترێت و، بەتەنیا بۆ یەك مەسەلە لە مەسەلەگەلی سیستەمەکە ناوترێت.[2]

هەروەك تیۆر بۆ ئەوشتەی کە لە بەرامبەری ئەنجامدانی کرداری بواری واقیعی دایە بە کاردەبرێت، واتە بۆ ئەو ئەزموونەی خاڵییە لە مەبەست و رووتە لە هەر پراکتیکێکی کرداری. دیسان بۆ ئەو شتەیش بە کاردەبرێت کە بەرامبەرە لە گەڵ زانین و مەعریفەی سادەو گشتی کە پشت نابەستێت بە ئەنجامگەلی کرداری و بە هەندەکی دەمێنێتەوە[3].

---

[1] بڕوانە: محمد تقي مصباح اليزدي – الإيديولوجية المقارنة، ترجمة عبدالمنعم الخاقاني، دارالمحجة البيضاء، بيروت، ١٤١٣هـ، ١٩٩٢م، ل ٤٩–٥٠.

[2] د. محمد محمد الحاج حسن الكمالي – محاضرات في الفلسفة الإسلامية، ط ١، مجد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ١٤١٣ هـ – ١٩٩٣م ، ل ١٢٢.

[3] د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٣.

لە بەرامبەر زاراوەی تیۆر یان زانستی مەعریفەدا زاراوەی ئیپستمۆلۆژیا[1] "Epistemology"بەکاردەهێنرێ کە زاراوەیەکی یۆنانییەو لە دوو بڕگە پێکهاتووە: "Episteme" کە بە مانای (مەعریفە)یە و، "Logos" کە بە مانای (زانست)ە یان بە مانای تیۆرە[2].

کەوابوو ئیسپستمۆلۆژیا بە مانای تیۆری زانست یان فەلسەفەی زانست دێت، واتە لێکۆڵینەوەی بنەماکانی زانستەکان و شیمانە و ئەنجامەکانیان بە لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەگرانە کە مرۆڤ بگەیەنێت بە بەرچاوخستنی بنچینەی لۆژیکی و بەهای بابەتی زانستەکان.

مەبەستی ئێمە بە تیۆری مەعریفە لێرەدا لێکۆڵینەوەیەکی رێکخراو یان توێژینەوەیەکە لە بارەی مەعریفە: بنچینەکەی، چییەتی (ماهیة) مەعریفە، تواناو گونجانی، رێگاکانی گەیشتن پێی، سروشت و سنوور و بەهاکەی، هەروەها گەڕان و باسکردنە لەو گرفتە فەلسەفیانەی لە

---

1 زاراوەی ئیپستمۆلۆژیا بۆ یەکەم جار لە لایەن فەیلەسوفی سکۆتلەندی (جیمس فریدریك فیرییر – ) ( J.F. Ferrier ١٨٠٨– ١٨٦٤م) لە کتێبەکەیدا (بنەماکانی میتافیزیکیا) لە ساڵی ١٨٥٤ز بە کارهاتووە، ئەمەش بۆ جیاوازی کردن لە نێوان دوو جۆری سەرەکی فەلسەفە ئەوانیش: ئیپستمۆلۆژیاو ئەنتۆلۆژیا ، بە مانای باسکردن لە مەعریفە و لە بوون. بڕوانە: د. علی حسین کرکی– الأبستیمولوجیا فی میدان المعرفە، ط ١، شبکة المعارف ، بیروت، ٢٠١٠، ل ١٥.

2 د. نبیل عبدالحمید عبدالجبار – الفلسفة لمن یرید ، مطبعة الحاج هاشم، اربیل، ٢٠٠٤، ل ٢٦.

پەیوەندی نێوان کەسی زانیار (الذات العارفة) و بابەتی زانراو (الموضوع المعروف)دا سەرهەڵدەدەن[1].

هەروەها مەبەستمان بە تیۆری مەعریفە باسکردنە – وەك دکتۆر راجیح کوردی دەڵێ[2] – لە ڕادەی لێکچوون لە نێوان تەسەوری زەینی و واقیعی دەرەکی دا، وە ڕادەی خزمەتی ئەم پەرەسەندنەی تیۆری بوون و ڕادەی گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ بیروباوەڕی ئایینی. ئینجا ئەمە بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی میحوەریی ئوسوڵیی، نەك تەنیا لێکۆڵینەوەیەکی وەسفیی پاشکۆی زانستی دەروونناسی، بۆ مەسەلەی زانست لە قورئانی پیرۆزدا، لەگەڵ بەرچاوخستنی تێڕوانین (التصور)ی ئیسلامیی لە بەرامبەر دیدگاو تێڕوانینە فەلسەفییەکانی تر، نەك بە شێوەی بەراورد کردن، چونکە بەراورد لە نێوان بەرنامەی خودایی و هزری مرۆڤدا ناکرێت، بەڵکو بە وەرگرتنی سەرمەشقی لە قورئان بە هێنانی بەڵگەکانی بەرامبەر و وەڵامدانەوەیان و زێدە دڵنیایی، شتەکانیش بە دژەکانیان دەناسرێن.

پێشتر باسمان لە ڕۆڵی زانایانی ئیسلام و گرنگی دانیان بە مەعریفە کرد لە میانەی نووسراو و دانراوەکانیانەوە کە بە پێویستی نازانین لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

---

[1] د. عبدالمنعم الحفني –سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٨٨. د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤.

[2] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤.

## بابەتە سەرەكییەكانی تیۆری مەعریفە بریتین لە[1] :

١ـ  توانای مەعریفە: تیایدا باس لە ڕادەی توانا و بڕستی مرۆڤ دەكرێت بۆ بە دەستهێنانی مەعریفە، كە روو بە ڕووی پرسی گومان لە ڕاستی و دڵنیابوون لێی دەبێتەوە.

٢ـ  سەرچاوەكانی مەعریفە: هەستەكان، عەقڵ، یان هەردووكیان، رێگای سرووش (الوحی) لای خاوەن  ئایینەكان، رێگای تر وەك ئیلهام، نۆڕین (الكشف)، تیژبیریی (الحدس).

٣ـ  جیاوازی كردن لە نێوان مەعریفەی پێشوو، واتە ئەوەی پێش ئەزموون كەوتووە و، ئەو مەعریفەیەی لە رێگەی بەدەستهێنان (الإكتساب) پەیدا دەبێت.

٤ـ  سروشتی مەعریفە: كە تیایدا باس لە سروشتی پەیوەندی نێوان كەسی زانیار و شتە زانراوەكە دەكرێت.

٥ـ  بەهای مەعریفەو سنوورەكانی.

گەرچی زۆربەی توێژەرانی بواری تیۆری مەعریفە پێیان وایە نابێ زانستی لۆژیك (المنطق) لە گەڵ تیۆری مەعریفە تێكەڵ بكرێت، بەڵام هەندێكی تر پێیان وایە دەكرێ هەندێ لەو بابەتانەی لێیەوە نزیكن تێكەڵی بكرێن، لەوانەش بابەتەكانی زانستی لۆژیك، چونكە لە ڕاستیدا هەریەكە لە تیۆری مەعریفەو زانستی لۆژیك لە دەوری ڕاستی

---

[1] بڕوانە: د. عبدالرحمن بن زيد الزنيدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠ – ٥١. د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٦–٦٧. د. حربي عباس عطيتو و د. موزة محمد عبيدان – سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥١ – ١٥٢.

(الحقيقة)دەخولێنەوە، تیۆری مەعریفە بابەتێکە چەندین ڕێگەو هۆکار لە خۆدەگرێت کە مرۆڤ دەیانگرێتە بەر بۆ ئەوەی بگات بە ڕاستی، زانستی لۆژیك–یش لە سەر گەڕان و باس لە ڕاستی وەستاوە بە شێوەیەك خودی هزر (الفکر) دەکاتە بابەتی توێژینەوەو بەدواداچوونی، لە بری ئەوەی جیهان و شتە دەرەکییەکان بکاتە بابەتی باس و خواسی خۆی[1].

فەیلەسوفانی مسوڵمان و زانایانی (کەلام)یش کاتێ باسیان لە تیۆری مەعریفە کردووە، زانستی لۆژیکیان وەك زانستێکی پێوەری ڕاستی کە یاساکانی هزر چارە دەکات لە گەڵیا کۆکردۆتەوەو، لە باس و گەڕان بەدوای ڕاستی یان تیۆری مەعریفەدا جیایان نەکردۆتەوە، بەڵکو بایەخدانیان بە واقیعی دەرەکی هاوتەریب لەگەڵ بایەخدانیان بە سیستەمی هزری لۆژیکی ڕۆیشتووە، پێچەوانەی ڕێبازی فەیلەسوفانی خۆرئاوا کە لۆژیکیان لە مەسەلەکانی تیۆری مەعریفە دوورخستەوە، تا ئەو کاتەی (دیکارت) هات و هەردوو ڕای پێکەوە لە گەڕان بە دوای ڕاستیدا کۆکردنەوە، بەشێوەیەك پێوەری هاوڕێکبوونی حەقیقەتی لەگەڵ واقیعدا بەستەوە یان کۆکردەوە لە گەڵ پێوەری هاوڕێکبوونی هزر لەگەڵ خۆیدا[2].

---

[1] د. راجح عبدالحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٧.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٧.

## پەیوەندی مەعریفە بە زانستەوە

بە پێویستی دەزانین تیشکێك بخەینە سەر بۆچوونی موعتەزیلەکان و ئەهلی سوننە لە پەیوەست بە پەیوەندی مەعریفە و زانست بە یەکەوە، بەڵام سەبارەت بە مەعریفەو زانست بە گشتی پێشتر بۆچوونی هەردوولامان لە پێناسە کردنیان بۆیان روون کردۆتەوەو لێرەدا ناچینەوە سەری.

### أ- لای موعتەزیلەکان:

زانست و مەعریفە لای موعتەزیلەکان هاو واتان، چونکە زانست بۆ بەندەکان یان بۆ خەڵك رۆشن بوونەوەو هاتنەدی (تحقق)ە، ئەمانەش واتای ئەوە دەگەیەنن کە دەروونی زانا بەو شتەی تاوتوێی کردووەو بەدوایدا گەڕاوە ئۆقرە بگرێت و پیَی دڵنیابێت، لە بەر ئەوە جیاوازی لە نێوان ئەو دوو زاراوەیە (مەعریفەو زانست) و سوودەکەیاندا نییە، بۆیە هەموو زانا (عالم)ێك پێی دەوترێ زانیار (عارف)[١].

### ب ـ لای ئەهلی سوننە:

گەرچی بە لای ئەهلی سوننەوە لەو رووەوە هاوواتایی لە نێوان زانست و مەعریفەدا هەیە کە هەردووکیان زانین و پەی بردن بە شێك دەگەیەنن بەو شێوەیەی کە بوونی هەیە، بەڵام پێیان وایە کە لە چەند روویەکەوە جیاوازیان هەیەو لە یەك جیان[٢]:

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩ — ٥٠.

١ـ مەعریفە نەزانینی لێ پێشکەوتووەو بە دوای قۆناغی نەزانیندا هاتووە، یاخود پێزانین (إدراك)ێکە نەزانینی لێ پێشکەوتووە (مسبوق بجهل)، زانستیش بە هەمان شێوە، بۆیە بۆ خودای گەورە دەوترێت زانا (عالم) نەك زانیار (عارف)[1].

٢ـ هەندێ جاریش مەبەست بە مەعریفە ئەو زانستەیە بێئاگایی (غفلة) لێی پێشکەوتووە، بەڵام زانست وانییە، بۆیە خودا بە زۆر زاناو زانای پەنهان و زۆر زانای نادیارەکان ناودەبرێت نەك بە زانیار (عارف).

٣ـ مەعریفە بۆ پەیبردن و پێزانینی سادە (إدراك البسيط) بە کاردێت، بەڵام زانست بۆ پێزانینی ئاوێتە (المركب)، بۆیە دەڵێیت (عرفتُ اللهَ) خودام ناسی و نابێژیت (علمتُ اللهَ) خودام زانی.

٤ـ مەعریفە بۆ شتێك بە کاردێت کە بە شوێنەوارەکانی پەی پێدەبردرێت و زاتی ئەو یان خودی ئەو شتە پەی پێ نابردرێت، بەڵام زانست بۆ ئەو شتە بە کار دەبرێ کە پەی بە خودی خۆی دەبردرێت، بۆیە دەوترێت (عرفت الله) خودام ناسی و، ناوترێت (علمت الله) خودام زانی.

٥ـ پێچەوانەی مەعریفە نکوڵی (إنكار) کردنە، پێچەوانەی زانستیش نەزانین (جهل)ە، چونکە مانای مەعریفە دانپیانان و سەلماندنی لە خۆ گرتووە.

---

[1] الجرجاني – التعريفات – سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٧.

٦ـ ئەبو حەییانی تەوحیدی (دوای ساڵی ٤٠٠ ك/ ١٠١٠ز کۆچی دوایی کردووە) دەڵێ: مەعریفە تایبەتە بە شتە بەرهەستەکان و مانا هەندەکی یەکان (المعانی الجزئیة)، لە کاتێکدا زانست تایبەتە بە شتە ماقووڵەکان و مانا هەمەکی یەکان (المعانی الکلیة)، بۆیە دەرهەق بە خودا دەوترێت دەزانێ یاخود زانایە و ناوترێت خودا دەناسێ یاخود زانیار (عارف)ە.

٧ـ وتراویشە زانست لە وێناکردنەکان (التصورات) و زانستیش لە ڕاستاندنەکان (التصدیقات)دا بەکاردێت، بۆیە دەوترێـت (عرفتُ اللهَ ولا تقول علمتُهُ)، چونکە لە مەرجەکانی زانست ئەوەیە دەوری تەواوی دۆخەکانی زانراو بدات، هەربۆیە خودا خۆی بە زانست وەسف کردووە نەك بە مەعریفە.

## وشەو زاراوە هاوماناکانی مەعریفە و زانست

زانست چەمکێکی کۆکەرەوە (جامع)ە بۆ زۆرمانا چونکە زانست یان مەعریفە بریتییە لە پەیوەندی نێوان زاناو زانراو، و لە نێوان کەسی زانیار و بابەتی زانراودا، بۆیە هەریەکە لە مەعریفەو زانست چەندین وشە و زاراوەی هاومانایان هەیە، لە وانە:

١ـ هەستپێکردن (الشعور): کە بە مانای زانین و پەی پێبردنە. لە چەندین ئایەتی قورئاندا وشەی شعور بە مانای زانین هاتووە، لەوانە: (وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاءٌ وَلَكِنْ لَا

تَشْعُرُونَ)[١]. واتە: مەڵێن بە وانەی لە ڕێگای خوادا دەکوژرێن مردوو، بەڵکو ئەوانە زیندوون بەڵام ئێوە هەستی پێناکەن و نایزانن.

٢ـ پێزانین (الإدراك): یەك لە ماناکانی دەورەدانی شت و تەواو زانینیەتی، خوا دەفەرموێت: (لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ)[٢]. واتە: چاوی بەدیهێنراوان هێزی ئەوەیان نییە خوا ببینن و ڕاستینەی خوایان پێبزانرێت، خودا ڕاستینەو جەوهەری چاوەکان و خاوەن چاوەکانیش دەزانێ‌و بە وردی ئەیانبینێ، خودا چاکە کارە لە گەڵ بەندەکانی و وردیاتی شتەکان دەزانێ و ئاگادارە بە بەهەموو شتێك.

٣ـ وێناکردن (التصور): پێشەوا ڕازی دەڵێت: ئەگەر هێزی عاقڵانە لە سەرمانا راوەستاو بە تەواوی هەستی پێکرد، ئەوە مانای وێناکردن و تەسەورە.

٤ـ پاراستن و ئەزبەرکردن (الحفظ): جورجانی پێناسەی کردووەو دەڵێ: (الحفظ ضبط الصور المدركة)[٣]. واتە: بریتییە لە تۆمارکردن و کۆنترۆڵکردنی وێنە درکپێکراوەکان.

٥ـ بیرخستنەوە (التذکر): ئەو وێنانەی ئەزبەرکراون و پارێزراون کاتێ لادەچن و زەین دەیەوێت بیانگەڕێنێتەوە، ئەم هەوڵدانە

---

[1] سورەتی بەقەرە، ئایەتی (١٥٤).

[2] سورەتی ئەنعام، ئایەتی (١٠٣).

[3] الجرجانی – التعریفات – سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٠.

بیرخستنەوەو بیرهێنانەوەیە، ئەمەش نهێنییەکە خودا نەبێت کەس نایزانێت.

٦ـ فامکردن و تێگەیشتن (الفهم والفقه): جورجانی لە بارەی (الفهم) دەبێژێ: (تصور المعني من لفظ المخاطب)، واتە: تەسەورکردن و زانینی مانای شتە لە واژەی دوێنراو[1]. لە بارەی (الفقه)یش دەڵێ لە زماندا: (عبارة عن فهم غرض المتكلم من كلامه)[2]، واتە: بریتییە لە تێگەیشتن لە مەبەستی قسەکەر لە قسەکانی دا، خوای گەورە لە بارەی بێباوەڕەکان کە تێناگەن دەفەرموێ: (فَمَالِ هَؤُلَاءِ الْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا)[3]. واتە: ئەم کۆمەڵ و خەڵکە چییان لێ قەوماوە کە تۆ قورئانیان بۆ دەخوێنیتەوەو تێناگەن؟.

٧ـ عەقڵ و هۆش (العقل): فەیرۆز ئابادی وشەی (العقل)ی بە زانست (العلم) لێکداوەتەوەو دەڵێ: (العقل: العلم) أو العلم (بصفات الأشياء، من حُسنها وقُبْحها وكمالها ونقصانها..)[4]. واتە: عەقڵ بە مانای خودی زانست دێت، یاخود بە مانای زانینی سیفەتی شتەکان دێت لە جوانی و ناشیرینییان و تەواوی و ناتەواوییان.

قورئانی پیرۆزیش زۆرجار وشەی (یعقلون)ی بە مانای (یعلمون – دەزانن) بە کارهێناوە، وەك دەفەرموێ: (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ

---

1 الجرجاني – سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣.

2 هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢.

3 سوڕەتی نیساء، ئایەتی (٧٨).

4 الفيروز آبادي – القاموس المحيط – سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٩٦.

يَعْقِلُونَ)[1]. واتە: بە ڕاستی لە مانەدا نیشانەی توانایی و دەسەڵاتی خودا هەیە بۆ ئەوانەی دەزانن و هۆشمەندن.

٨ـ زانین و گێڕانەوەی بیرکردنەوانە (الدراية والرواية): یەکەمیان بە مانای ئەو زانین و مەعریفەیە دێت کە بە شێوەی پێچاوپێچ بەدەست دێت، دووەمیشیان ئەو زانین و مەعریفەیەیە دوای بیرکردنەوەو تێڕامانی زۆر دەست دەکەوێت، دەوترێت (أَرْوَيْتُ فِي الأَمْرِ: نَظَرْتُ وَفَكَّرْتُ)[2]. واتە: لە کارەکەم ڕوانی و بیرم لێکردەوە.

٩ـ حیکمەت (الحكمة): کە چەندین مانای هەیە، لە وانە: زانست و زانین، تێگەیشتن، دانایی و ئەوەی مرۆڤ لە نەزانی دوور دەخاتەوە، زانینی باشترین شتەکان بە باشترین زانست و دانانی هەر شتەی لە شوێنی خۆیدا.

خوای گەورە دەفەرموێت: (يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ)[3]. واتە: خودا زانایی و هێزو فام و دانایی و توانای کردەوەی ڕێك و ڕاست دەدات بە هەرکەسێك بیهەوێت، هەر کەسێکیش ئەو زانایی و ژیری و دانایی و حیکمەتەی بدرێتی، ئەوا خێرێکی زۆری پێدراوە، وە تەنیا ئەو کەسانە بیردەکەنەوە کە خاوەنی هۆش و بیرێکی تەواو و دامەزراو بن.

١٠ـ هەندێ وشەی تریش بە مانای زاست هاتوون، لەوانە:

---

[1] سوڕەتی نەحل، ئایەتی (٦٧).

[2] الفيروز آبادي– سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٤٤.

[3] سوڕەتی بەقەڕە، ئایەتی (٢٦٩).

ـ بەڵگەنەویست (البدیهە): وەك زانینمان بەوەی یەك نیوەی دووانە.

ـ هۆشمەندی (الكیاسە): ئەویش ئەو شتەیە كە بەڵگەیە لە سەر توانای مرۆڤ بۆ باشتر وەرگرتنی ئەو شتانەی سوود بەخشترینن.

ـ ئەزموون (الخبرة): كە ئەو شتەیە لە ڕێگەی ئەزموونەوە دەزانرێت و پەی پیێ دەبردرێت.

– ڕا (الرأی): مرۆڤ لە پێشەكییەكان (المقدمات) ڕاو ئاكامی خوازراو دەست دەخات.

–فیڕاسەت (الفراسە): لە زماندا بە واتای تێفكرین و جێگیربوون دێت و لە زاراوەی ئەهلی حەقیقەتیشا بە واتای نۆڕینی یەقین و بینینی شتی پەنهانە..[1][2]

---

[1] بڕوانە: الجرجانی – التعریفات – سەرچاوەی پێشوو، ل ٧١.

[2] بۆ زیاترو درێژەی لێكدانەوەكانی ئەم وشەو زاراوانە، بگەڕێوە بۆ: د. راجح عبدالحمید الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠ – ٥٩.

لەم بەشەدا بە کورتی تیشك دەخەینە سەر ڕوانگەی قورئان دەربارەی مەعریفە، واتە ئەو زانینەی پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەیە، نەك قسەکردن لە سەر زانست بە شێوەیەکی گشتی، چوون بابەتەکە زۆر درێژو فراوان دەبێت، چونکە گەر باس لە زانست بکەین دەبێ لە دوو لقەوە لێی بدوێین، لقێکی پەیوەندی بە خوداوە هەیە (زانستی خودایی) و لقێکیشی پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەیە (زانستی مرۆیی).

لێرەدا پرسیارێك ڕووبەڕوومان دەبێتەوە کە ئاخۆ لە قورئاندا شتێکمان دەست دەکەوێت ببێتە ماددەیەك بۆ بنیاتی تیۆرێك لە مەعریفەی زانستی و ئایا ڕوانگەیەك هەیە پێی بوترێت ڕوانگەی قورئان بۆ مەعریفە، وە ئەگەرهەیە چۆنە؟

## ڕوانگەی قورئان بۆ تیۆری مەعریفە

سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێین کە قورئان وەك پرۆگرامێکی خودایی تەواو و گشتگیر خۆی لە خۆیدا پێی ناوترێت تیۆر (النظرية)، بەڵکو ئەسڵەن بە وەسفکردنی بە تیۆر لە هەر هونەرو بوارێکدا بێت، ناتوانین مافی خۆی پێ بدەین، چونکە قورئان بەرنامەیەکی خوداییە بۆ ڕێنمایی مرۆڤایەتی و ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای ژیان و زۆر لەوە گەورەترو مەزنترە بە تیۆرو بیردۆزو بۆچوونی فەلسەفی هێمای بۆ بکرێت، واتە قورئان پرۆگرامێکی پراکتیکی واقیعییە: (قَدْ جَاءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِمَّا كُنْتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ (١٥) يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُمْ مِنَ

الظُّلُمَاتِ إِلَي النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَي صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ)[1]. واته: بێگومان لای خوداوه ڕووناکی و قورئانتان بۆ هاتووه که ڕێگەی ڕاستتان بۆ روون دەکاتەوەو، به هۆی ئەو قورئانەوه ئەو کەسانه رێنمایی دەکات که دوای رەزامەندی خودا دەکەون و مەبەستیان بێ لێیان ڕازی بێت و له تاریکیەکان دەریان دەهێنی و ئەیانخاته ڕووناکی ئیسلام به ئیزنی خۆی و شارەزای ڕێگای ڕاستیان دەکات.

بەڵام له گەڵ ئەوەدا که قورئان ناتوانرێ وەك کتێبێکی فەلسەفی — به مانای کۆمەڵێك هزرو بیروبۆچوونی سەرچاوه گرتوو له عەقڵ، که بەپێی پرۆگرامێکی دیاریکراو ریز بەند کرابن به مەبەستی یەکخستن و کۆکردنەوەی چەند بنەمایەك بۆ راڤەکردنی دیاردەگەلێکی گەردوونی — سەیر بکرێت و له بۆتەی چەمك و تیۆر و تێزو میتۆدەکانی مرۆڤدا قەتیس بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا، رێگرییەك نییه له قورئاندا بۆ گەڕان بەدوای تیۆرێکی مەعریفه له قورئان و هەڵهێنجانی بنەما مەعریفی و پەروەردەیی و ئاراستەیی و زانستییەکان، به پشتبەستن به وێناکردن و تەسەوری قورئانیی وەك خاڵی دەستپێك، هەروەك دەشزانین فەیلەسوفانی ئیسلام و زانایانی کەلام، هەروەك زانایانی هاوچەرخیش، له سەر ئەم بابەتەیان نووسیوەو گفتوگۆیان له بارەوه کردووەو هەوڵیانداوه له گۆشەنیگای قورئانەوه تیۆرێکی مەعریفه له قورئان و به کۆششێکی مرۆییانه دابڕێژن، تەنانەت جەخت لەوه دەکەنەوه که

[1] سورەتی مائیده، ئایەتی ١٥ — ١٦.

بازنەی باس و خواس و توێژینەوە دەربارەی مەعریفە و سروشتی مەعریفەو زانست لە ئیسلامدا زۆرفراوانترە لە توێژینەوەی فەلسەفی بەشێوەیەکی گشتی بۆ مەعریفەو زانست، چونکە فەلسەفە بە شێوەیەکی جوداو سەربەخۆ دەڕوانێتە زانست و زانینی مرۆڤ، ئەمە لە لایەك، لەلایەکی ترەوە وەك بووێك قسە لە مەعریفە دەکات بێ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەو بنچینەی راستەقینەی خۆی.

بەڵام مەعریفەی مرۆڤ لە ئیسلامدا بە دوای قسەکردن لە زانستی خودایی دێت، هەروەك مەعریفەی بەشەریی وەك تایبەتمەندییەکی مرۆڤ درێژ دەکاتەوە تا دەیگەیەنێتەوە خودا وەك بەدیهێنەری مرۆڤ[1]، کە هۆکارەکانی تێدا دروستکردووە، هەروەك دواتر نموونەی قورئانیی بۆ دێنینەوە.

پێشتر باسمان لەوە کرد کە مەعریفە بۆ مرۆڤ بە کاردێت و زانست بۆ خوداو پاشان بۆ مرۆڤیش، هەر بەم شێوەیەش زاراوەی مەعریفە بە دەرهاویشتەکانیەوە (المشتقات) لە حەفتاو یەك شوێن لە قورئاندا هاتووە، لە سی و دوو شوێندا بە مانای زانست هاتووەو هەموویان تەنیا زانست و مەعریفەی مرۆڤ دەگەیەنن[2]، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە زاراوەکان زۆر گرنگن بۆ گوزارشتکردن لە ڕاستی، چونکە زاراوە قاڵب و چوارچێوەی ماناکەیەتی و خزمەتی مەبەستەکە دەکات، بۆیە زۆر گرنگە

---

1 د. عبدالرحمن بن زيد الزنيدى – سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٦ – ٨٧.

2 د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٠.

چۆن زاراوەیەك بەكاردێنیت، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ فەلسەفە – نەخاسمە فەلسەفەی خۆرئاوا – دەبینین زاراوەی (سەرچاوەکانی مەعریفە) کە مەبەست ڕێگەو میکانیزمی گەیشتنە بە مەعریفە، بە جیاواز لەو مەبەستە بە کاردەهێنرێت کە لە فەلسەفەی ئیسلامیی دا بە کاردێت، چونکە پەیوەندی مرۆڤ بە خوداوە لە چەمکی فەلسەفیی دا ڕۆشن نییە، بە پێچەوانەی فەلسەفەی ئیسلامیی کە ڕەهەندێکی خودایی دەداتە سروشتی مەعریفەو پەیوەستی دەکاتەوە بە خوداوە (عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ)[1]. واتە: خودا مرۆڤی فێری شتێ کردووە کە پێشتر نەیزانیوە.

هەروەها لە فەلسەفەی ئیسلامیی دا بوون (الوجود) کە مەعریفەش بەشێکیەتی بەر لەوەی ڕوو لە زانینی بکەین سەلماوە و ناکرێ نکوڵی لێ بکرێت، هەر لەو ڕوانگەشەوە لە بەشی چوارەمدا پرسی توانای مەعریفەو چۆنیەتی بەدەستهێنانی دەخەینە بەرباس و بەڵگەکانی ڕێبازگەلی شککەرایی و ڕێبازگەلی دڵنیایی تاوتوێ دەکەین، تیایدا ڕاشکاوانە دان بەوەدا دەنێین کە زانست و مەعریفە مومکینن، ئەمەش بەوە ڕوون دەکەینەوە کە خودا مرۆڤی وا دروست کردووە تواناو شایستەیی و لێهاتوویی ئەوەی تێدایە فێرببێت و هۆش و عەقڵی بە کاربێنێت و بگەڕێت بە دوای پرسیارە وەڵامنەدراوەکان و وەڵامەکانی وەربگرێت و لە نهێنییەکانی بوون و مرۆڤ و گەردوون تێبگات.

---

[1] سوڕەتی عەلەق، ئایەتی (٥).

## بنەماكانی تیۆری مەعریفە لە قورئاندا:

دكتۆر راجیح كوردی كاتێ باس لە تیۆری مەعریفە دەكات، دڵنیایی دەدات كە لە قورئانی پیرۆزدا بنەمای ڕاست و دروست هەن كە دەگونجێن ببنە ماددەی بنیاتنانی تیۆرێك بۆ مەعریفە، ئەو بنەمایانەشی لە چەند خاڵێكدا ڕیزبەند كردووە، هەروەها دكتۆر عەبدوڕڕەحمان زونەیدی ئەویش كاتێ باس لە سروشتی مەعریفە لە ئیسلامدا دەكات چەند خاڵێكی باسكردووە، هەردووكیان بە پشتبەستن بە ئایەتەكانی قورئان باسەكانی خۆیان دارشتووە، ئێمەش بە سوودوەرگرتن لەم دوو نووسەرە، بنەماكانی تیۆری مەعریفە لە قورئاندا بەم شێوەیە باس دەكەین[1]:

١- مەعریفەی مرۆڤ لە پاش قسەكردن لە بارەی زانستی خوداییەوە دێت، قورئان دەفەرموێ: (قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ)[2]. واتە: پێیان بڵێ: ئایا ئێوە زاناترن و لە خودا باشتر دەزانن یان خودا زاناترەو باشتر دەزانێت؟

(قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا)[3] واتە: فریشتەكان وتیان: خودایە! تۆ پاك و بێخەوشی و ئێمە هیچ زانستێكمان نییەو هیچ نازانین مەگەر ئەوە نەبێ كە تۆ فێرت كردووین). لێكۆڵینەوەی زانایانی كەلام و

[1] بڕوانە: د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢ – ٧٤. د. عبدالرحمن بن زيد الزنيدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٦ و دواتری.

[2] سوڕەتی بەقەڕە، ئایەتی (١٤٠).

[3] سوڕەتی بەقەڕە، ئایەتی (٣٢).

بیروباوەڕی مسوڵمانانیش بۆ زانستی مرۆڤ بە دوای باسکردنیان دێت لە سیفەتی زانست و زانین بۆ خوای گەورە.

٢ـ قورئانی پیرۆز چەند بنەماو بناغەیەکی روونی لە بارەی رێگاکانی مەعریفە لە خۆگرتووە، خودای مەزن دەفەرموێ: (وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ)[1]. واتە: خودا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرکردووە لە حاڵێکدا کە هیچتان نەدەزانی، هەروەها هێزی بیستن و بینین و دڵی بۆ دروست کردوون، بەشکم شوکرانە بژێرین. هەروا دەفەرموێ: (وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ)[2]. واتە: وە خودا شتی وای فێر کردوویت کە لە مەوپێش نەتدەزانین.

٣ـ سەرچاوەی ئەم مەعریفەیە خوای گەورەیە: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ)[3]. واتە: بخوێنە، بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروستکردووە، مرۆڤی لە پارچەیەك خوێن دروستکردووە، بخوێنەو پەروەردگاری تۆ بەخشندەترینە، ئەو خودایەی مرۆڤی بە هۆی قەڵەمەوە فێرکردووە، مرۆڤی فێری ئەو شتانە کردووە کە پێشتر نەیزانیون. (وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَي الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَاءِ إِنْ كُنْتُمْ

---

[1] سوڕەتی نەحل، ئایەتی (٧٨).

[2] سوڕەتی نیساء، ئایەتی (١١٣).

[3] سوڕەتی عەلەق، ئایەتی (١– ٥).

صَادِقِينَ (٣١) قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٣٢) قَالَ يَا آدَمُ أَنْبِئْهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ فَلَمَّا أَنْبَأَهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ)[١]. واته: خوا ناوی هەموو شتەکانی فێری ئادەم کردو تێی گەیاند، پاشان وێنەی ئەو شتانەی پیشانی فریشتەکان داو پێی وتن: دەی ئەگەر ڕاست دەکەن ناوی ئەم شتانەم پێ بڵێن. وتیان: خودایە تۆ پاك و بێگەردی و ئێمە زانستمان نییەو هیچ نازانین مەگەر ئەوە نەبێ کە تۆ فێرت کردووین، بە ڕاستی هەر خۆت زانایت بە هەموو شتێك و کارلەجێیت. ئینجا خوا فەرمووی: ئەی ئادەم ناوی ئەو شتانەیان پێ بڵێ، جا کە ئادەم ناوەکانی پێ وتن، خودا فەرمووی: ئەی پێم نەوتن من نادیارو پەنامەکی ئاسمانەکان و زەوی دەزانم و ئەوەش کە دەری دەبڕن و ئەوەی دەیشارنەوە هەمووی دەزانم؟

٤- قورئان باسی سەرچاوەو ئامرازەکانی مەعریفەی کردووە لە هەستەکان و عەقڵ یان دڵ، ڕێگایەکی تری ناوازەشی زیاد کردووە کە لە ڕێگاو ئامرازەکانی مرۆڤ نییە، ئەویش ڕێگای سروش و ئیلهامە.

٥- سروشتی مەعریفەشی باس کردووە کە سروشتێکی بەدەستهێنان (إکتساب)ی یە، خودا دەفەرموێت: (وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا)[٢]. واتە: خودا ئێوەی لە سکی دایکتان

---

[1] سورەتی بەقەرە، ئایەتی (٣٣-٣١).

[2] سورەتی نەحل، ئایەتی (٧٨).

دەرکردووە لە حاڵێکدا کە هیچتان نەدەزانی. (عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ)[1]. واتە: خودا مرۆڤی فێری شتێك کردووە کە پێشتر نەیزانیوە، ڕێگەکانی ئەو بەدەستهێنانەشی ئاماژە پێداوە لە بیرکردنەوە و بیرخستنەوەو هەستکردن و تێگەیشتن وهتد.

٦- بوارەکانی مەعریفەشی روون کردۆتەوە، بواری سروشتی یان جیهانی بەرهەست و بینراو کە بە هەستەکان و عەقلێ هەستی پێ دەکرێت، هەروەها جیهانی پەنهان (عالَم الغيب) کە ڕێگاکەی سروش (الوحی)ە، عەقڵیش بوونی دەسەلمێنێت و، ئەوەندەی خودا بواری دا بێت و بڕست و توانای بە مرۆڤ دابێت فام دەکرێت و دەزانرێت، وردەکاریەکانی تری نادیارەو جگە لە خوا کەسی تر نایزانێت مەگەر لە ڕێگەی سروشەوە پێمان بگات.

٧- ئامانجی مەعریفەشی لە ژیانی مرۆڤدا روون کردۆتەوە، کە لە خزمەتی ئامانجی بەندایەتیکردنی مرۆڤ بۆ خودا دابێت، بە باوەڕو پەرستش و زانست و زانین و کردەوەوە: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)[2]. واتە: من جنۆکەو ئادەمیزادم دروست نەکردووە مەگەر بۆ ئەوە کە بمپەرستن.

٨- قورئانی پیرۆز مەعریفەی گێڕاوە بە بناغەی سەرکردایەتیکردنی مرۆڤایەتی و هەڵگرتنی ئەمانەت و سپاردەی ڕێنمایی و هەڵسان بە ڕۆڵی

---

1 سورەتی عەلەق، ئایەتی (٥).

2 سورەتی ذاریات، ئایەتی (٥٦).

جێنشینایەتی لە سەر زەوی و سوود وەرگرتن لەو شتانەی خوا ڕامی کردوون بۆ مرۆڤ: (وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ)[1]. واتە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەمووی بۆ ڕام کردوون و ئەمە هەمووی لەوەوەیە: (أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ)[2]. واتە: ئایا ئێوە نابینن خودا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بۆی ڕام کردوون؟).

٩- قورئان ڕێژەیی بوونی مەعریفەی مرۆڤ روون دەکاتەوە: (وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ)[3]. واتە: وە لە ژوور هەموو زانایەکەوە زانایەکی تر هەیە. (وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا)[4]. واتە: ئێوە ئەندازەیەکی کەم نەبێ زانست و زانیاریتان پێ نەدراوە.

١٠- قورئان هەرسێ سەرچاوەو رێگای سەرەکی مەعریفەی پێکەوە کۆکردۆتەوە کە بریتین لە (سروش، عەقڵ و، هەست). هەروەك هەردوو بواری مەعریفە کە دوو بواری بوون (الوجود)ن: واتە ئەم جیهانەو دوا رۆژ، یان جیهانی بەرهەست و جیهانی نادیار، هەردووکیانی لە یەك ئایەتدا کۆکردۆتەوە، وەك دەفەرموێ: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُوحِي إِلَيْهِمْ مِنْ أَهْلِ الْقُرَي أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كَانَ

---

[1] سوڕەتی جاثیە، ئایەتی (١٣).
[2] سوڕەتی لوقمان، ئایەتی (٢٠).
[3] سوڕەتی یوسف، ئایەتی (٧٦).
[4] سوڕەتی ئیسرا، ئایەتی (٨٥).

عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا أَفَلَا تَعْقِلُونَ)[1]. واته: له پێش تۆدا كەسمان ڕەوانه نەكردووه (بۆ ئامۆژگاری) مەگەر چەند پیاوێكی وا كه سروش (وەحی) مان بۆ كردوون له ئەهلی دێهات و ئاوەدانیەكان (واته پێغەمبەران مرۆڤن و فریشته نین)، ئایا بۆ ناگەڕێن به زەویدا تا ببینن و بزانن سەرەنجامی خەڵكانی پێش ئەوان چۆن بوو، بێگومان ماڵی ڕۆژی دوایی زۆر چاكتره بۆ ئەوانەی پارێزكارن، ئایا ئەمانه تێنافكرن و عەقڵ و هۆشیان بەكارناهێنن؟

١١- قورئان بانگەوازێكه بۆ ئازادكردنی عەقڵی مرۆڤ له كۆت و بەندی لاسایی كردنەوەو شوێنكەوتنی كوێرانەو، مرۆ بانگ دەكات بۆ بیركردنەوەو خستنەگەڕی عەقڵ و هۆشی و سەرنجی بۆ لای بوونەوەر و گەردوون و، دەروون رادەكێشێت، هەروەها ستایشی ئەو كەسانه دەكات كه بیردەكەنەوەو خاوەن ژیرین، سەركۆنەی ئەوانەش دەكات كه تێناگەن و نازانن و بیرناكەنەوه و، ئەوانه به ناخ و دڵ كوێر وەسف دەكات، وەكو دەفەرموێت: (أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ)[2]. واته: ئایا ئەمانه به سەر زەویدا نەڕۆیشتوون تا دڵێكی وایان ببێ به هۆیەوه هۆش و عەقڵیان ببێ و بزانن چی بكەن، گوێیەكی وایان ببێ شتی پێ ببیسن، چونكه تەنیا دیتن به چاو بەس نییه، وا ئەبێ چاو كوێر دەبینێ بەڵام سوودیشی نییه، چونكه ئەو دڵانەی له سنگدان ئەوان كوێر دەبن.

---

[1] سوڕەتی یوسف، ئایەتی (١٠٩).

[2] سوڕەتی حەج، ئایەتی (٤٦).

(أَوَلَمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ وَأَنْ عَسَي أَنْ يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ)[1]. واته: ئایا بۆچی سەیری موڵکی گەورەی ئاسمانەکان و زەوی و ئەو شتانەی خوا دروست کردوون ناکەن و لێیان ورد نابنەوە؟ بۆ ئەوەندە بێئاگان لەوانەیە ئەجەل و سەرەنجامیان نزیك بووبێتــەوە، ئیتر پاش قورئان باوەڕ بەچی دێنن؟

١٢- قورئان دڵنیایی و یەقینی کردووە بە پێوەری مەعریفەو زانین و گومان و دوودڵی رەت دەکاتەوەو بە زانست و زانین ناوزەدیان ناکات: (إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَي الْأَنْفُسُ)[2]. واته: ئەوانە تەنیا شوێنی گومان و خەیاڵ دەکەون، هەروا شوێنی شتانێ دەکەون کە نەفسی خۆیان ئارەزووی دەکات. (وَمَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا)[3]. واته: وە هیچ لە مەسەلەکە نازانن و ئاگایان لێ نییەو تەنیا شوێنی گومان نەبێ ناکەون و، گومانیش لە بارەی زانینی ڕاستییەوە هیچ دادێك نادات و چ سوودێکی نییە.

هەموو ئەمانە دەکرێ ببنە بناغەی تیۆرێك لە مەعریفەو زانین لە رووی چییەتی مەعریفە، توانای مەعریفە، سەرچاوەو ئامرازەکانی، سروشتی، رێگاکانی، پێوەرو بەهاکانی.

لە بەشی دادێت دەچینە سەر باسکردن لە توانا و ئیمکانی بەدەستهێنانی مەعریفە.

---

[1] سوڕەتی ئەعراف، ئایەتی (١٨٥).

[2] سوڕەتی نەجم، ئایەتی (٢٣).

[3] سوڕەتی نەجم، ئایەتی (٢٨).

## دەستپێك:

قسەکردن لە توانای مەعریفەو سنوورەکانی، سەردەکێشێ بۆ پرسیارگەلێك: ئایا مەعریفە دەکرێ بەدەست بهێنرێت یان نا؟ ئایا مانای ئەوە کە مرۆڤ دەتوانێ مەعریفە بەدەست بێنێت ئەوەیە کە دەتوانێ هەموو شتێك بزانێت و پەی بە هەموو ڕاستییەکان ببات و بگاتە یەقین؟ ئایا واقیعێکی دەرەکی (خارجی) لە پشت ئیدڕاك و زانینەکانی ئێمەوە بوونی هەیە؟ یاخود بوون تەنێ بریتییە لە بووە زانراوەکان؟

ڕەنگە ئەوانەی هۆگرییەکیان نییە لە گەڵ فەلسەفە یاخود مێژووی فەلسەفەیان نەخوێندۆتەوە، ورووژاندنی ئەو مەسەلەیە لایان جێی سەرسامی بێت، چونکە بوونی واقیعی دەرەکی شتێکی خۆڕسکی (فطري)یە بە واتایەك لە واتاکان و، هەر مرۆڤێك لە خۆیەوە بۆ ئەوە دەچێت کە شتانێکی پەیوەست بە ئیدڕاك لە دەرەوەی جوغزی ئیدراك و هەستەکانی مرۆڤ بوونیان هەبێت، بۆ نموونە کاتێك کەسێك دەبینێت، ئەوا بە واقیعێك لە دەرەوەی زەین و زانینی خۆی هەژماری دەکات، یان کاتێ دەنگێك دەبیستێت، ئەوا باوەڕ دەکات کە بووێك هەیەو دەنگێکی دەرەکی بوونی هەیە گەرچی تا ئەو سات گوێی لێ نەبووە.

دیارترینی ئەوانەی ئەو مەسەلەیەیان ورووژاندووە، ئەوانەن لە مێژووی فەلسەفەدا پێیان دەوترێت سۆفیستەکان[1] (السوفسطائیون) یان

---

[1] سۆفیستەکان کۆمەڵێك کەس بوون لە سەدەی پێنجی پێش لە دایك بوون کاریان گەڕان بوو بە نێو شارو ئاوەدانییەکانی یۆنان و لە بری ئەو وتارو وانانەی پێشکەشیان

شکگەراکان (الشکاك)، بۆیە دواتر مەسەلەی توانای مەعریفە بووە یەکەمین بابەتەکان لە پۆلێنکردنی تاوتوێکردنی باس و خواسەکانی مەعریفەدا، تەنانەت زانایانی کەلام و بیروباوەڕی ئیسلامیی دەروازەی یەکەمی کتێبەکانی خۆیان لەبارەی زانستەوە دەست پێدەکردو لە نێویشیدا بەشێکیان تەرخان دەکرد بە نێوی (سەلماندنی زانست و ڕاستییەکان)، یان (سەلماندنی زانست و پووچەڵکردنەوەی قسەی ئەوانەی نکوڵی لە ڕاستییەکان دەکەن)، چونکە لای ئەوان دەبوایە بۆ ئەوەی کەسێ بتوانێ قسە لە مەعریفەو پرس و بابەتەکانی بکات، سەرەتا توانای بەدەستهێنانی مەعریفە لای ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرو بێچەندو چوون بێت. بەهەرحاڵ، بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی پێشوو، چەندین ڕێبازی ئیپستمۆلۆژی سەریان هەڵداوە، کە لەم بەشەدا قسەیان لە سەردەکەین، سەرەتا بە ڕێبازگەلی گومان بە هەردوو بەشەکەیەوە گومانی ڕەهاو گومانی مەعریفی دەست پێدەکەین، پاشان دێینە سەر ڕێبازگەلی دڵنیایی (یەقین)، عەقڵگەراکان و ئەزموونگەراکان، لە گەڵ تاوتوێکردنی بەڵگەکانیان و وەڵامی بەڵگەکان.

---

دەکرد، کرێیان لە خەڵکەکە وەردەگرت، سۆفیست یان (سوفسطائي Sophist)بەو کەسە دەوترێت کە پەنا دەباتە بەر هەڵەکاریی، بەراوردکارییەك بەکاردێنێ کە رواڵەتەکەی راستی و ناواخنەکەی پووچە، دەیەوێت گوێگرەکانی فریو بدات.

ئەمانە لە سۆفیستە ناودارەکانن: جۆرجیاس، پرۆتاچوارس، برۆدیکوس، هیبیاس، لیقافرون.. بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: د.عبدالمنعم الحفنی — المعجم الشامل لمصطلحات الفلسفة — سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١١ — ٤١٢. الموسوعة الفلسفية المختصرة — نقلها عن الانجليزية فؤاد كامل وجلال العشري وعبدالرشيد الصادق، مكتبة النهضة، بغداد/ ١٩٨٣، ل ٢٦٧.

## یەکەم: ڕێبازگەلی گومان و توانای مەعریفە

گومان لە زماندا بە مانای پێچەوانە یان دژی دڵنیایی و یەقین دێت، وەکو زاراوەش چەنین ماناو دەلالەت و چەمکی فرە لایەن و فرە ڕەهەند لەخۆ دەگرێت بە هۆی پراکتیك بوونی بە سەر زۆر بواری هزری و زانستی و فەلسەفی و مەعریفی دا. لە رووی زاراوەیی جورجانی ئاوا ماناکەی روون کردۆتەوە: (الشك: هو التردد بين النقيضين بلا ترجيح لأحدهما على الآخر عند الشاك)[1]. واتە: شك بريتييە لە دوودڵی لە نێوان دووشتی دژ بە یەك بێئەوەی لایەکیان بە سەر لاکەی تریان لای شککەرا بە ڕاستتر دابنرێت.

هەندێ لە فەیلەسوفان و خاوەن بیران و ئەوانەی بە دوای پرسیارەکانی پێشوودا گەڕاون گومانیان کردووە لە توانای مرۆڤ بۆ زانینی حەقیقەتی شتەکان و پەی پێبردنیان، بەڵام گومانیان لە توانای مرۆڤ بۆ مەعریفە، جیاوازی خستۆتە نێوانیان لە رادەو قەبارەی ئەو گومانەو سنوورەکانی مەعریفە، بە گشتی گومانی پەیوەست بە مەعریفە بۆ ئەم دوو بەشەی خوارەوە دابەش دەبێت:

### أ- شکگەرایی ڕەها (الشك المگلق):

ئەم بەشە لە شکگەرایی پێی وایە مەحاڵە مرۆڤ بتوانێ مەعریفەیەکی یەقینی بەدەست بێنێت، یاخود بگاتە ڕاستی لە هەر بوارێك لە بوارەکان.

---

[1] جورجانی – التعريفات – سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦.

لەوانەی ئەو بۆچوونەیان هەیە، هەندێ لە فەیلەسوفە یۆنانیەکانن وەك (چۆرچیاس – ٣٨٠پ. ز کۆچی دوایی کردووە) کە هەڵوێستی خۆی لەم مەسەلەیەدا بەم شێوەیە کورت کردۆتەوە:

١- هیچ شتێك بوونی نییە، ٢- ئەگەر شتێکیش هەبێت ئەوا مرۆڤ توانای زانینی نییە، ٣- ئەگەر بیشزانرێت و ئەو گریمانەمان کرد ئەوا ناکرێ گوزارشت لەو مەعریفەیە بکرێت و بە کەسانی تر بگەیەنرێت[١].

هەروەك یەکێکی تر لە دیارترین نوێنەرانی شکگەرایی فەیلەسوفی یۆنانی (بیرۆن – ٢٧٥ پ.ز کۆچی دوایی کردووە)ە، کە بە یەکەم ڕێبازی فەلسەفی دادەنرێت کە بناغەی لە سەر گومانی تەواو بنیات نرابێت سەبارەت بە بەدەستهێنانی مەعریفەی مرۆڤ، ئەو دەڵێ: ( پێویستە متمانەمان بە عەقڵ و هەست نەبێت و بێ ڕاو بۆچوون بمێنینەوەو، پێویستە لە یەك کاتدا ڕەت بکەینەوە و بشسەلمێنین یاخود نەڕەت بکەینەوەو نە بشسەلمێنین)[٢]، هەروەها لە گومانکارەکان فەیلەسوفی ئینگلیزی (مۆنتانی – ١٥٥٣ز کۆچی دوایی کردووە)ە.

بە گشتی زانایانی مسوڵمان شکگەراکانیان بۆ سێ بەش دابەش کردووە بە پێی هەڵوێستە گومانییەکەیان و لە چوارچێوەی سۆفیست و شکگەراییدا پۆلێنیان کردوون [٣]:

---

[1] د. عبدالرحمن بن زید الزنیدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠. د.نبیل عبدالحمید عبدالجبار – الفلسفة لمن یرید، مطبعة الحاج هاشم، اربیل، ٢٠٠٤، ل ٣١.

[2] د. عبدالرحمن بن زید الزنیدي – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١.

[3] د. راجح عبدالحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٤ – ٨٥.

ـ  نازانمکارییەکان (اللاأدرية)، کە لەو باوەڕەدان مرۆڤ چونکە ناگاتە ڕاستی، بۆیە دەبێ بووەستێ و حوکم نەدات، ڕەخنەش لەوە دەگرن کە هەست و عەقڵ ڕێگای زانین و مەعریفە بن.

بیرۆن بە ڕێبەرو خاوەنی ڕێبازی نازانمکارییەکان دادەنرێت کە نکوڵی لە زانست و یەقین دەکەن[١].

ـ  نکوڵیکارییەکان (العنادية)، ئەوانەی نکوڵی لە ڕاستی شتەکان دەکەن و پێیان وایە هەر بوونیان نییەو خەیاڵن وەکو نەخشی سەرئاو[٢].

ـ لایمنییەکان (العندية)، ئەوانیش دەڵێن راستی شتەکان بە شوێن باوەڕبوون پێیانەوە دێت، واتە مەعریفە پەیوەندی بە بابەتی زانراوەوە نییە، بەڵکو بە خودی کەسی زانیارەوە هەیە، راستی ئەوەیە کە تۆ دەیزانی و من دەیزانم و لای من حەقیقەتە نەك لە خودی خۆیدا چۆنە.

بە گشتی ئەم جۆرە لە گومان، گومانێکی فەلسەفی رووخێنەرە، چونکە خاوەنەکەی بە گومان دەست پێدەکات و بە گومان کۆتایی دێت، لە یەك کاتدا هۆکارو ئامانجەو خاوەنەکەی ناگەیەنێت بە راستی یان دۆزینەوەی راستی، بۆیە لە هەموو حاڵەتەکاندا گومانێکی نەرێنییە.[٣]

---

[1] یوسف کرم — تأريخ الفلسفة اليونانية، دار القلم، بيروت، دون سنة الطبع، ص ٢٣٢.

[2] الجرجاني — التعريفات — سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٨.

[3] د. حربي عباس عطيتو و د. موزة محمد عبيدان — سەرچاوەی پێشو، ل ١٥٦.

شکگەراکان چەند بەڵگەو پاساوێکیان بۆ هەڵوێستی ئینکاری خۆیان هێناوەتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە[1]:

١- ئێمە ئامرازێکمان نییە بۆ مەعریفە کە لێی دڵنیابین و بمانگەیەنێتە یەقین، راستە هەستەکان هەن، بەڵام ئەوان هەڵمان دەخەڵەتێنن، ئەوە نییە شتێك لە یەك کاتدا گەورەیە گەر لێی نزیك ببیتەوە و بچووکە گەر لێی دوور کەویتەوە؟ شکگەراکان عەقڵیش رەت دەکەنەوە، چونکە دەڵێن هەروەك هەستەکانی مرۆڤ تووشی هەڵە دەبن، بە هەمان شێوە عەقڵیش چونکە یاساکانی لە جیهانی دەرەوە بە هۆی هەستەکانەوە وەردەگرێت، ئەویش بە هەمان شێوە ئامادەیە بۆ هەڵەو فریودانمان، چونکە لەوانەیە شتێك ئەمڕۆ بەلای منەوە جوان بێت یان راست و رەوان بێت، بەڵام سبەینێ ببێتە شتێکی ناحەزو درێو یان هەڵە، کەوابوو حوکمدانی عەقڵ لە سەر میزاجی کەسەکەو دۆخ و حاڵەتەکەی وەستاوەو جێی پشت پێ بەستن نییە.

٢- جیاوازی ئیدراك و زانین یەکێکی ترە لە بڕوبیانووەکانیان، چونکە دەڵێن هەست و بۆچوون و حوکمدانمان رێژەییەو بە جیاوازی کەسەکان و بابەتەکان گۆڕانکاری بەسەردا دێت و لە یەك حاڵەت ناوەستێت، بەڵکو جیاوازییەکە تا ئاستی نەسازی و دژیەکی بە ڕۆشنی دیارە لە نێوان فەیلەسوفەکان لە لایەکەوەو لە نێوان ئەوان و غەیری

---

[1] د. نبيل عبدالحميد عبدالجبار – سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢. د.راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٥ – ٨٩ . د. عبدالرحمن بن زيد الزنيدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١ – ٦٣.

ئەوان لەلایەکی ترەوە، واتە جیاوازی راوبۆچوونەکانیش لە نێوان خەڵك لای شکگەراکان بۆتە بەڵگە و پاساو بۆ ڕەتکردنەوەو نکوڵیکردن لە ڕاستی.

٣- نەزان بە شتەکان، دەڵێن هەموو شتەکان پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە، جا بۆ ئەوەی شتێك بزانین پێویستە هەموو شتەکان بزانین، کاتێ ناتوانین هەموو شتەکان بزانین، مانای وایە بە هیچ شتێکمان نەزانیوە.

٤- بەڵگەیەکی تریان لە سەر نەزانینی مەعریفە ئەوەیە دەڵێن ناتوانرێت بەڵگە بۆ شتێك بێنینەوە، چونکە هەر بەڵگەیەك بێنیتەوە بۆ شتێك، ئەو خۆیشی پێویستی بە بەڵگە بۆ هێنانەوە هەیە. ئەمەش دووچاری زنجیرە (تسلسل)مان دەکات، چونکە هەر بەڵگەیەك پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە هەیەو ئەمەش کۆتایی نایەت، یاخود دەمانخاتە نێو خولاو خول یان خولدانەوە (دَوْر) چونکە مەسەلە بەڵگە بۆ هێنراوەکەمان کردۆتە بەڵگەی مەسەلە بەڵگە پێهێنراوەکە.

٥- بەڵگەنەویستەکان (البدیهیات) یەقینی نین، بۆیە ناکرێ ببنە بنەمای مەعریفە.

بۆیە لەم گێژاوەی گومانداراەکان تێی کەوتوون، باشترین چارەسەر بەلایانەوە ئەوەیە مرۆڤ بووەستێت و هیچ بڕیارێك نەدات.

تا دوایین بەڵگە و دەلیل و پاساوەکانیان، کە ئەمڕۆ هیچ نرخ و بەهایەك بۆ ئەم جۆرە گومان و ئینکارە ڕەهایە بۆ توانای مرۆڤ و زانینی مەعریفەو پەی بردنی بە ڕاستییەکان بوونی نییە، بەڵکو ئەمڕۆ هەستناکرێت ئەم جۆرە لە ڕێبازی شکگەرایی ڕەها بەم وێنە ساکارییە

بوونی هەبێت، ڕەنگە لە سەر ئاستی تاك کەسانی گومانکار هەبن نەك بە شێوەی ڕێبازێکی لەم شێوەیە.

گەرچی زۆر لە زانایان و لێکۆڵەرەوە مسوڵمانەکان بە باشیان نەزانیوە کاتی خۆیان لە وەڵامدانەوەی ئەوانەدا بە فیڕۆ بدەن، چونکە هیچ سوودێکی نابێ لەگەڵ شککگەراکان کە ئەوان شتە بەرهەست و ڕۆشن و بەڵگەنەویستەکان و بەدیهیات ڕەتدەکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بازێ لە زانا و لێکۆڵەرەوان بە درێژی وەڵامیان داونەتەوە، بۆ نموونە سەبارەت بە هەستەکان، وتراوە ئەوان (شککگەراکان) کاتێ تانە لە هەستەکان دەدەن کە بەتاکە سەرچاوەی مەعریفەیان زانیون و بنەماو بناغەی بەڵگەنەویستەکانیش هەر هەستەکانن، جا کە هەستەکان پووچببنەوە، ئەوا بەڵگەنەویست و بەدیهیاتەکانیش پووچدەبنەوە، بەڵام ئەمە ڕێگایەکی دروست و ساغڵەم نییە، چونکە پێویستە عەقڵ لە پاڵ هەستەکانا کاری خۆی بکات و هەڵەی هەستەکان ڕاست باتەوە، بۆیە ناکرێ پشت بە هەڵەی هەستەکان ببەسترێت بۆ نکوڵیکردن لە زانست و بەدەستهێنانی مەعریفە و ئەم بکرێتە پاساوی مەسەلەکە، چوون ئەم جۆرە هەڵانە دەکرێ ڕاست بکرێنەوە، ئیتر بە هەستێکی تر یاخود بە ئەزموونکاری لە گەڵ عەقڵ و بەڵگەدا. هەروەك ڕێژەیی بوونی ئیدراك و پێزانینی هەستی نابێتە هۆو پاساوی نکوڵیکردن لە مەعریفەو زانین، چونکە ئەوەی هەستەکان پێشکەشمانی دەکەن لەوانەیە هەندێ جار شتێکی جوداو زیادە بێت، بەڵام نەساز و دژیەکیش نەبێت، هەر زانیارییەکیش کە هەستێك پێشکەشی دەکات لەوانەیە لە خوێندنەوەو

لێکدانەوەیدا کەسی گومانکار بە هەڵە بچێت و وابزانێت لە گەڵ زانیاری هەستێکی تردا دژو نەسازە، بەڵام لە ڕاستیدا وانەبێـت.

بەهەمان شێوەش مەسەلەی راجیایی کە کارێکی دروست و واریدەو دەشکرێ و مەحاڵ نییە خەڵکی لە سەر کۆمەڵێك شتی سەلمێنراو و بەدیهی و بنەڕەتی رێکبکەون. ئایا دەشکرێ هەموو شتەکان پێکەوە بزانرێن و گەر وا نەبوو هیچمان نەزانیوە؟ یاخود بەدیهیات یەقینی نین و لە بەڵگە هێنانەوەدا (تسلسُل) و (دَوْر) روودەدات، بۆچی؟! مەگەر بە بەڵگە بە تەنیا زانست و یەقین بە دەست دێت؟ نەخێر، بەڵکو هەندێ مەسەلەی هەمەکی (کلی) تری رۆشن هەن کە لە زەین و هۆشمانداو بەڵگەهێنانەوە لایان بە کۆتا دەگات و دەبنە هۆکاری گەیشتن بە زانست و مەعریفە، مەگەر کێ هەیە باوەڕ نەکات کە هەموو (الکل) لە هەندەك (الجزء) گەورەتر نییە؟ ئایا پێویست بەوە دەکات بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە یان شتێکی بەدیهی و بەڵگەنەویستە؟[1]

لە ڕاستیدا گومانکارەکان دەستە پاچەن لەوەی بیروبۆچوون و رێبازەکەی خۆشیان بسەلمێنن و بەڵگە لە سەر ئەوە بێننەوە کە خۆیان هیچ نازانن، واتە لێرەدا گومان لەوەش دەکەن کە بۆخۆیان گومان دەکەن، خۆ خودی گومانەکە سێ بەڵگەنەویستی لە خۆگرتووە ناکرێ گومان تیایاندا دروست ببێت، ئەمانیش: بوونی کەسی بیرکەرەوە، ڕەوا نەبوونی کەمکردن (بە مانای گومانکار مانای گومان و زانین و نەزانین و

---

[1] بۆ زیاتر بڕوانە: د. راجح عبدالحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٩١ – ٩٤.

یەقین و مرۆڤ.. دەزانێت)، بەسبوونی عەقڵ بۆ زانینی ڕاستی و حەقیقەت[1].

گومانکارەکان و شکگەراکان ئەو ئاستەی نەزانینیشیان بە خۆیان ڕەوا نەدەبینی کە دانی پێدابنێن، ((لە بەر ئەوەی گەیشتنە ئەو بڕوایەی گومان لەوە دەکەن ئەوە خۆیان کەسێکی گومانکارن، چونکە ئەگەر بانگەشەی ئەوەیانکرد گوایە ئەوان گومانکارن، ئەوە مانای وایە دەیسەلمێنن کە ڕاستی ئەوە دەزانن کەسانێکی گومانکارن، بەوەش لەگەڵ خودی خۆیاندا دووچاری دژکاری و ناکۆکی دەبنەوە))[2].

بەهۆی نالۆژیکی ڕێبازەکەیانەوە، هەرلە نێو کۆمەڵگەو ژینگەی خۆیاندا بەرپەرچیان درایەوە و یەکەم کەسیش کە دژ بە سۆفیستەکان و شکگەراکان ڕاپەڕی و بە توندی بەرەنگاریان بوویەوە، (سوقڕات) بوو کە ناوی لەخۆی نابوو (فیلاسۆف) واتە خۆشەویستی حیکمەت و دانایی، دواتر وشەی (فەلسەفە)و وشەی (فەیلەسوف) لەوەوە وەرگیران. ڕێبازی واقیعیش (ریالیزم)ی پێدەوترێت کە ڕێبازێکە باوەڕی بە بوونی واقیعی دەرەکی و توانای درکپێکردن و زانینی هەیە. پاشان ئەم ڕێبازە لە سەر دەستی (ئەفلاتوون)و (ئەرستۆ)ی قوتابی بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاوبوویەوەو توانی تاڕادەیەکی تەواو کۆتایی بە ڕێبازی سۆفیستەکان بێنێت، گەرچی دواتر بیروهزری ڕێبازەکەیان لە

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٥.

[2] ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل – ئەپستمۆلۆژیاو فەلسەفە، بەرگی یەکەم، چ٢، چاپخانەی شیهاب، ٢٠١٢، ل ١٢٢.

بەرگێکی هەندێك لۆژێکی تردا لە سەر دەستی (پیرۆن) سەری هەڵدایەوە، جیاوازیان لە گەڵ سۆفیستەکان ئەوەبوو کە باوەڕیان بە واقیعی دەرەکی هەبوو، واتە ئەوان گومان دەکەن و دوای گومانیش دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە ناتوانن بگەنە ڕاستی[1].

## گومانی شوێنکەوتەکان ( شك المقلده ):

جۆرێکی تر لە شکگەرایی گومانی ئەوانەیە لە هزری ئیسلامیی دا پێیان دەوترێت شوێنکەوتەکان یان تەقلیدیەکان کە باتنییەکان یان فێرکارییەکانن، ئەوانە بوونی ڕاستی ڕەتناکەنەوە، بەڵام گومان لە توانای عەقڵ دەکەن لە گەیشتن بە مەعریفە. بۆ نموونە ئیسماعیلییەکان دانیان ئەنا بە زانست و زانین و توانای بەدەستهێنانی مەعریفە لە لایەن مرۆڤەوە، بەڵام ئەو مەعریفەیە لە ڕێگەی هەست و عەقڵەوە بەدەستنایەت، بەڵکو ڕێگە و سەرچاوەی ئەو مەعریفەیە بریتییە لە ئیمامی مەعسوم، کە لە ڕێی ئەویشەوە زانستەکە بۆ مەعسومێکی تر دەگوازرێتەوەو بەم شێوەیە دەبێتە میراتی و فێرکردنی بۆماوەیی.

ئەم بۆچوونەش ڕەتکراوەتەوە، چونکە ڕاستە مرۆڤ هەموو شتێك لە خۆیەوە نازانێت و پێویستی بەوە هەیە ئەو شتانەی نایانزانێت لە پێغەمبەرەوە وەریان بگرێت بە تایبەت لە شتە پەنهان و نادیارەکان،

---

[1] محمد تقي مصباح اليزدي – الإيديولوجية المقارنة – ترجمة عبدالمنعم الخاقاني، ط ١، دارالمحجة البيضاء، بيروت، ١٤١٣ﻫ – ١٩٩٢م، ص٦٠. تأريخ فلسفەی راتلج، مجموعه نوسيندگان، ترجمەی حسن مرتضوی، ج١، نشر چشمه، تهران، ١٣٩٠ هـ ش، ص ٤٢٢.

بەڵام ئەو کەسەی مەعسومەو دوورە لە تاوان و پارێزراوە تەنها پێغەمبەرە نەك کەسێکی تر، ئەو شتانەی پەیوەندیدارن بە بواری ئایینی و شەرعی لە حاڵەتی بوونی دەق لە قورئان و سوننەتدا بۆیان دەگەڕێینەوە، ئەگەر نەبوو، کار بە ئیجتیهادو ڕاو بە کارهێنانی عەقڵ دەکرێت[1]. کەوابوو دەکرێ لە پاڵ سروش وەك سەرچاوە، عەقڵ و هەستەکانیش وەك سەرچاوەی مەعریفە بناسرێن و کەڵکیان لێ وەربگیرێت.

## گومانی باوەڕیی ( شك إيماني ):

ئەم جۆرە لە گومان بە گومانی باوەڕیی ناوزەد کراوە، واتە مەبەستەکەی نکوڵی کردن نییە بەڵکو ئیمان و باوەڕە، بەڵام متمانەی نییە بە عەقڵ و هەست، لێرەدا ئیمان و باوەڕ یان کرداری ویست کە بڕیاری بیرکردنەوە دەدات، هەنگاوی یەکەمە بەرەو مەعریفەو زانین ئەم شککەرایانە گەرچی دان دەنێن بە بوونی هەستەکان، بەڵام دەڵێن یەقینمان نییە بەرامبەر ئەو هەستە ئیدراکیانە جیهانێکی واقیعی هەبێت مەگەر لە ڕێگەی باوەڕ و ئیمانەوە یەقینەکە حاسڵ ببێت.

ئەم جۆرە گومان و بیرکردنەوەیە لەو چەمکە مەسیحی یە سەرچاوەی گرتووە کە پێی وایە مرۆڤ کاتێ لە دایك دەبێت ئاوێتەی تاوان و هەڵەبووە بە هەڵەی باوکی مرۆڤایەتی ئادەم – سڵاوی خوای لە سەر بێت –کە بۆ منداڵەکانیشی دەگوازرێتەوە بێ ئەوەی هیچ تاوانێك

[1] بڕوانە: د.راجح عبدالحميد الكردي – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٩ و ٩٧.

یان گوناحێكیان ئەنجام دابێت. جا گەر مرۆڤ هەر بە شێوەی خۆڕسکی و فیترى تاوانبار بێت ناتوانێ بە تەواوی راستییەكان بزانێت و ئەگەر هەندێكیشی زانی و پەی پێبرد، ئەوە هەموو هەقیقەتەكە نییە زانیویەتی، دواجار هەر مەعریفەیەك لای مرۆڤ هەبێت شێواو و ناتەواوە. بۆیە دەبێ مرۆڤ خودی خۆی كە تێكەڵی تاوان بووە هەڵبوەشێنێتەوە و گومانی هەبێت لە بوونی هەر شایستەییەك بۆ مەعریفەی ڕاست و، خۆی بداتە دەست بانگەوازێكی دەرەكی كە ئەویش ئیمان یان سروش (وحی)ە، بە پێی تێگەیشتنی كەنیسە، چونكە ئەوەی لەو تەنگژەو زەلكاوە رزگاری دەكات هەر ئەو دەتوانێ مەعریفەی دروستی پێ بدات بێ ئەوەی مرۆڤ هیچ بەهایەكی لە سەرچاوەی مەعریفە یان تێگەیشتن و راڤەكردنیدا هەبێت.

ئەم گومانەش دەگەڕێتەوە بۆ جیهانبینی و دیدگای ئایینەكان بۆ مرۆڤ. ئیسلام وا لە مرۆڤ دەڕوانێت كە بە پاكی لە دایك دەبێت و هیچ گوناح و تاوانێكی نییە، وەك پێغەمبەر – درودی خوای لە سەر بێت – دەفەرموێ (كل مولود يولد علي الفطرة وإنما أبواه يُهوّدانه ويُنصّرانه و يُمجّسانه) (متفق عليه). واتە: هەموو لە دایك بوویەك بە پاكی و لە سەر فیترەت لە دایك دەبێت تەنیا دایك و باوكیەتی كە دەیكەن بە جوولەكە یان دەیكەن بە گاورو فەلە یان دەیكەن بە ئاگرپەرست.

مرۆڤیش ئامادەیی خێرو شەڕ یان چاکەو خراپەی تێدایە و خاوەن ویستی خۆیەتی هەروەك خوا دەفەرموێت: (وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ)[1]. واتە: وە ڕێگای چاکەو خراپەمان پیشان داوە. وە دەفەرموێت: (إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا)[2]. واتە: ئێمە مرۆڤمان شارەزا کردووە بە ڕێگای خێرو شەڕو چاکەو خراپە، جا یان ڕێگای خێر وەردەگرێ و سوپاسی خوای لە سەر دەکات، یان ئینکاری دەکات و ناسوپاس دەبێت و ڕێگای شەڕ دەگرێتە بەر. کەوابوو مرۆڤ لە توانستی مەعریفە و زانین بە هەست و عەقڵی بەرخوردارە، سروشیش ڕێگایەکە بۆ مەعریفەو بە هیچ شێوەیەك عەقڵ و هەست ڕەتناکاتەوە، بەڵکو سەلماندنی سروشیش لە ڕێگەی عەقڵەوەیە، ئەوە سروشە پێمان دەڵێ عەقڵ و هەستەکان سەرچاوەی زانین و مەعریفەن، لەو بوارانەشدا کە عەقڵ ناتوانێ بچێتە ناویەوە و ئەو شتانەی توانای مرۆڤ و عەقڵ و هەستەکانی تیایاندا سنووردارە، سروش یارمەتی دەدات و دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ مەعریفەو زانست و زانینی.

بۆیە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە باوەڕبوون بە تاوانباری مرۆڤ پێچەوانەی دادپەروەری خوداو ئەو فیترەتەیە کە خوا مرۆڤەکانی لە سەر دروست کردووە، چۆن تاوانێك نەیکردبێت لە سەری سزا دەدرێت یان تاوانی کەسێکی تر هەڵدەگرێت؟ ئەوەتا خوا دەفەرموێت: (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ

---

[1] سوڕەتی بەلەد، ئایەتی (١٠).

[2] سوڕەتی ئینسان، ئایەتی (٣).

أُخْرَي)[1]. واتە: هیچ نەفسێکی تاوانبار تاوانی کەسێکی تر لە ئەستۆ ناگرێ.[2]

ماوەتەوە بڵێین پاڵنەر و هۆکارەکانی شکگەرایی جۆراوجۆرن، لەوانە: ئامانجی سیاسی و ئاراستەکانی بێباوەڕی (إلحادی) و خواستی قازانج و دەسەلات، یان گومانکارەکان وەختێ شتێك یان مەسەلەیەك نازانن و تیایدا ناگەنە ئەنجام دێن بۆ راگتنی هاوسەنگی دەروونی و گوێ پێنەدانەکەیان، گوایە گومانەکەیان دەبێتە هۆی ئاسوودەیی عەقڵ و دەروون کە یەکێکە لە هۆکارەکانی خۆشی و شادی بۆ مرۆڤ.

یاخود گومانەکە بە پاڵنەری یان هۆکاری هاوسەنگی لۆژیکییە، کە گوایە مادام گومانکار ناگاتە ئەنجامێك گوایە بێلایەنی خۆی دەپارێزێت لەوەی بڕیار بە لایەکدا بدات. هەندێ جاریش پاڵنەرو هۆکاری ترە وەك شکستی هەندێ فەلسەفە و شۆڕش بە دژی بیروباوەڕ یان داب و نەریتی باو لە کۆمەڵگاکەدا وەك ئەوەی لە ئەوروپا دژ بە کەنیسە روویدا لە ئەنجامی خەفەکردنی عەقڵ لە لایەن دەسەلاتی کەنیسەو وەستانی دژ بە بیرکردنەوەو زانست و پێشکەوتنی مەعریفی کە بووە هۆی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی شەپۆلی گومان و بێ باوەڕی.

---

[1] سورەتەکانی : ئەنعام، ئایەتی (١٦٤) و ئیسرا ، ئایەتی (١٥) و فاطیر، ئایەتی (١٨) و زومەر، ئایەتی (٧).

[2] بڕوانە: د. راجح عبدالحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٠ – ٩١ و ل ٩٩ – ١٠٠.

## ب- گومانی میتۆدی ( الشك المنهجي ):

گومانی میتۆی یان زانستی گومانێکی ئەرێنی و بنیاتنەرە و نەرێنی و رووخێنەر نییە، چونکە ئەم گومانە کاتییەو مرۆڤ بە ویستی خۆی هەڵیدەسوورێنێ لەپێناو گەیشتن بە راستی و یەقین. واتە ئەم جۆرە گومانە وەك رێگایەك بە کاردەهێنرێت بە مەبەستی گەیشتن بە مەعریفەی راستەقینەو راستگۆیانەی زانست.

لە کۆندا (سوقرات) نوێنەرایەتی ئەم جۆرە گومانەی کردووە کە لە مێژووی فەلسەفەدا میتۆدەکەی لە کاتی دیالۆگ و وتووێژی لە گەڵ نەیارانیدا بە (تهکم) ناسراوە کە دەگاتە ئەنجامی ئەوەی عەقڵ لە هەڵەو کەم و کورپییەکانی وەك ئەو ڕاو بۆچوونە بێ بنەماو چەواشەکاریانەی سۆفیستەکان پاك بکاتەوە. هەروەك (ئەفلاتوون) نوێنەرایەتی دەکات کە گومانی لە شتە بەرهەستەکان کردو دواجار بە ئاراستەی سەلماندنی جیهانێکی راستەقینە و نموونایەتی بردی. هەروەك (ئەرستۆ) لە کتێبەکەیدا (لە دوای سروشت) گەیشتە ئەو باوەڕەی پەیوەندیەکی بەهێز هەیە لە نێوان گومان و مەعریفەی راستدا، بۆیە راسپاردەی ئەوە بوو کە گومان لە کاتی دەستپێکردنی هەر لێکۆڵینەوەیەکی زانستی دا کاری پێبکرێت[(1)].

[1] د. حربي عباس عطيتو و د. موزة محمد عبيدان — سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٧.

## دیكارت و گومانی میتۆدی

فەیلەسوفی فەرەنسی (ڕینیە دیكارت) بە بەهێزترین و ناودارترین نوێنەری گومانی میتۆدی یان زانستی دادەنرێت[1].

دیكارت هەوڵیدا فەلسەفەكەی لە سەر بنەمایەكی پتەو و یەقین بنیاد بنێت و بۆ گەیشتن بە یەقین پشت بە ڕاستیە روون و رۆشنەكان ببەستێت، بۆ ئەوەش باشترین رێگا لای دیكارت ئەوەیە بە گومان لە هەموو شتێك دەست پێ بكات. بۆیە دیكارت بە گومان و بەڵگە و پاساوی شككەراكان دەست پێدەكات و گومان لە هەستەكانی، خەیاڵی، عەقڵی دەكات، تەنانەت گریمانەی بوونی (رۆحێكی نەگریس) دەكات كە بەردەوام كار لە سەر سەرلێشێواندن و هەڵخەڵەتاندنی دەكات لە میانەی زانیاری هەڵە پێدانی، زیاد لەوەش گومان لە بوونی خۆیشی دەكات.

دیكارت لە كتێبی (تێڕامانی میتافیزیكیانە لە فەلسەفەی یەكەم)دا جەخت لە سەر ئەو گومانە دەكاتەوەو باس لەوە دەكات كە ئەو لە تەمەنێكی زووەوە هەندێ ڕاو بۆچوونی وەرگرتووەو لای وابووە راستن، بۆیە هەرچی لە سەر ئەو ڕاو بۆچوونانە بنیاتی ناوە هەمووی جێگای گومان و دوو دڵییە، هەربۆیە دەگاتە ئەو بڕوایەی گەر بۆ جارێكیش بێت دەبێ خۆی رزگاربكات و دابماڵێت لە هەموو ئەو ڕاو بۆچوونانەی پێشتر

---

1 دەربارەی دیكارت و گومانی میتۆدی، بڕوانە: د. عبدالرحمن زيد الزنيدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤. د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١. ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل – سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٨ – ١٤١.

باوەڕی پێیان هەبووە تاوەکو سەرلەنوێ شتەکان بە بناغەی نوێوە دەست پێبکاتەوە.

لەکاتێکدا دیکارت گومان دەکات هەستدەکات خۆی جۆرێك لە بیرکردنەوە پەیڕەو دەکات، بۆیە دەگاتە ئەوەی بڵێت (من گومان دەکەم مانای وایە من مومارەسەری جۆرێك لە بیرکردنەوەو تێڕامان دەکەم)، تەنانەت گەر گومان لەوە بکەم کە من گومان دەکەم مانای وایە بیردەکەمەوە. بۆیە دەگاتە ئەو ئەنجامەی وتە بە ناوبانگەکەی بڵێت: (أنا أفكر إذن أنا موجود – من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم)[1]، کەواتە بیرکردنەوەم بەڵگەی بوونمەو ئەمەش ڕاستییەکی روون و ئاشکرا و بێ گرێ و گۆڵەیە. شتەکان دەزانرێن بۆیە بە بیرکردنەوەو تێڕامان دەفامرێن، منیش بە ڕوونی دەبینم کە هیچ شتێك ساناترو رۆشنتر لە خودی خۆم نییە. کەواتە (دیکارت) بەم شێوەیە رێگا دەگرێتە بەر بۆ گەیشتن بە یەقین: سەرەتا لە خۆیەوە دەست پێدەکات و بوونی خۆی وەك بووێکی بیرکەرەوە دەسەلمێنێت، پاشان بوونی خوداو، ئینجا بوونی جیهان و بوونەر، ئەمانە پلیکانەی گەیشتن بە ڕاستیەکان و تەسلیم بوونە پێیان لای دیکارت.

دەتوانین بڵێین میتۆدی (دیکارت) بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و سەلماندنی دروستی بە دەستهێنانی مەعریفە بە سێ قۆناغدا رەت بووە:

---

[1] دکتۆر عەلی حسێن جابری لە کتێبەکەی (دروس في الفكر الفلسفي الاسلامي) دا ل ١٠٠، دەڵێت: ئەم وتە ناودارەی (دیکارت) لە هزری (ئیبن سینا) و باس و خواسەکانی دەربارەی نەفس و دەروون وەرگیراوەو سەرەتاکەی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

**أ– قۆناغی گومان:**

که تیایدا گومان له هەست و خەیاڵی دەکات، بەڵام دواتر بەرەو روونی و سەلماندنی راستییەکان دەڕوات بۆ ئەوەی بە باوەڕو ئیمان بگات لە رێگەی عەقڵی پوخت و پاڵفتەوە، کەوابوو ئەو گومانی لە پێناو گوماندا نەبوو، بەڵکو دەیەویست گومان بکاتە هۆکارێك بۆ ئازادکردنی عەقڵ لە ڕاو تیۆرو بۆچوونە هەڵەکان و وڕێنە و خەیاڵە پووچەکان بە تایبەت لە سەردەمێکدا کە کەنیسە دژ بە عەقڵ و زانست و بیر کردنەوە دەوەستایەوە و ببوە لەمپەر لە بەردەم بیرکردنەوە و بە دەستهێنانی زانست و مەعریفەی نوێدا.

**ب– قۆناغی رۆشنی بیرکردنەوەو لێکهەڵاوێردن:**

دیکارت ویستی لە قۆناغی بیرکردنەوەدا کە وتی (من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم)، لە مەعریفەوە بۆ بوون ودەرچوون لە بیروڕای سۆفیستەکان هەنگاو بنێت، ئەوەتا لە نامەیەکیدا کە بۆ هاوڕێیەکی بە ناوی (میلاند) ناردبووی (دیکارت) دەڵێ: ئەگەر سەبەتەیەك سێوت لابوو هەندێکیان ساغ و هەندێکیان بۆ گەن بوون و ئەوانی تریشیان بۆ گەن دەکرد، چی دەکەیت بۆ ئەوەی سێوە بۆ گەنەکان فڕێ بدەیت و ساغەکان بهێڵیتەوە؟ هیچ رێگایەك نییە تەنیا بە تاڵکردنی سەبەتەکە نەبێت لە هەموو سێوەکان و، پاشان پشکنینی یەك بە یەکی سێوەکان تاوەکو سێوە ساغەکان بخەیتەوە نێو سەبەتەکە و سێوە بۆگەنەکانیش دوور فڕێ بدەیت. بەم شێوەیە دەیەوێت سیستمی بیرکردنەوەی بنیات بنێت و پاش پاڵفتەکردنی بیکاتە بنەمای مەعریفەی ڕاست و دروست و یەقینی.

## ج- قۆناغی گرەنتی خودایی:

ئەو مەعریفەیەی خودا لە دەروونی هەر مرۆڤێکدا کە دروستی کردووە چاندوویەتی گرەنتی و زەمانەتە بۆ رۆشنبوونی بیرو ڕاو تێفکرین و تێگەیشتن لە خۆی و دەوروبەرو بوونەوەر، چونکە خودا ڕاست و ڕاستگۆیەو درۆ ناکات و کەس فریو نادات و هەڵناخەڵەتێنێت. بۆیە مەعریفەو زانست و زانینی مرۆڤ سەرەتا دەوەستێتە سەر ناسینی خۆی ئینجا ناسینی خوای گەورە.

دیکارت رۆشنایی دەخاتە سەر چارەسەری مەسەلەی بەدەستهێنانی مەعریفەو یەقین و دڵنیایی بەو رۆناکی (نور)ەی خودا بە شێوەی فیتری و خۆڕسك لە مرۆڤدا دروستی کردووە و دەڵێت: ((بۆیە بۆ من بە تەواوی روون بوویەوە کە دڵنیاییم لە هەر زانست و ڕاستی ئەو زانینە بەندە بە ناسینمان بۆ خودای هەق و ڕاست، بە شێوەیەك دەکرێ بڵێم: من پێش ئەوەی خودا بناسم لە توانامدا نەبوو هیچ شتێکی تر بە تەواوی بزانم، ئێستا کە خوای گەورەم ناسیوە رێگام بۆ ئاسان بووە تاوەکو زانست و مەعریفەو زانینی تەواو بۆ زۆر شت بەدەست بێنم))[1].

بەم شێوەیە دەبینین گومانی میتۆدی وەڵامێکی گورچگبڕ و یەکلاکەرەوەیە بەرامبەر گومانی ڕەها، (دیکارت)یش گومانەکەی بۆ ئەوە نەبوو بیکات بە رێبازی هزری خۆی وەك سۆفیستەکان. بەڵکو ئەو خۆی وەڵام دەداتەوەو جیاوازی لە نێوان گومانی خۆی و گومانی

1 د. راجح عبدالحمید الکردي –سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٦.

شککگەراکان روون دەکاتەوە کە ((من شوێنکەوتەی گومانکارەکان نیم کە گومانکردنیان تەنیا لە پێناو گومانکردنە، بەڵکو من مەبەستم گەیشتنە بە ڕاستی و جێگیری و یەقین و خۆپاراستن لە زەوی نەرم و لماوی بۆ گەیشتن بە بەردی ڕەق و لوس و تەختایی))[١].

دوا وتەمان سەبارەت بە دیکارت و گومانی میتۆدی ئەوەیە کە دیکارت لە گەڵ ئەوەی خاڵی لاوازی زۆر ئاوێتەی ڕاو بۆچوونەکانیەتی، بەڵام لە گەڵ ئەوەدا توانی گیان بکاتەوە بە بەر فەلسەفەی ئەوڕوپی و لە زۆر هەڵە و کەموکوڕی فەیلەسوفانی پێش خۆی ڕزگاری بکات و بیروڕاکانی ببنە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژووی فەلسەفەدا بە شێوەیەکی گشتی.

## غەزالی و گومانی میتۆدی:

پێشەوا غەزالی بەو جۆرە گومانەدا ڕەت بووە کاتێ گرفتاری قەیرانێکی دەروونی دەبێت و پاشان بە سەلامەتی لێی دەردەچێت.

غەزالی لە سەردەمێکدا ژیاوە کە بارگاوی بووە بە کێشە و جیاوازیە میتۆدیەکان و ئالۆزی زانستی، لە چاخێکدا فەلسەفە ڕۆڵی خۆی هەبووە و قسەی خۆی لە بوارە هزرییە جۆراو جۆرەکان هەبوو.

ئەویش وەك کەسایەتییەکی زانستی و فەیلەسوفێکی گەورەو توێژەرێکی بوارە زانستی و مەعریفییەکان بۆ گەڕان بە دوای ڕاستی و یەقین دا گوزەری بە نێو زانستەکاندا کردووەو ڕاو بۆچوون تیۆرە

---

[1] د. نبیل عبدالحمید عبدالجبار – سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤.

هزرییەکانی پشکنیوەو زۆر تامەزرۆی ئەوە بووە وەك خۆی دەڵێ بگاتە زانستی یەقین لە نێو ئەو کەشە ئاڵۆزەی ڕێبازو مەزەبە جۆراوجۆرەکان و ملکەچبوون و گوێڕایەڵی کوێرانەی خەڵك لە دەسەڵاتی مامۆستاکانیان.

دوای گەڕان و پشکنین، ناچاربوو تەسلیم بەوە بێت کە مەعریفە و زانین تەنیا لە ڕێگەی هەستەکانەوە بە دەست دێت، جا بۆ ئەوەی بە پرۆسەی گوماندا تێپەڕێت و بگاتە دوا قۆناغی لۆژیکی، هەستی کرد پێویستە لە سەری دڵنیابێ لەوەی ئەو مەعریفەیە یان ئەو زانینەی بە دەستی هێناوە یەقینییە یان نا؟ دوای ماوەیەك بۆی دەرکەوت کە نەخێر لە ڕێگەی هەستەکانەوە ناتوانێ بەرەو زانستی یەقین بڕوات و متمانەیان پێ ناکرێت، هەتا ئەوەی وتی: ((قد بطلت الثقة بالمحسوسات لأن حاکم العقل کذب حاکم الحس))[(١)]. واتە: متمانە بە بەرهەستەکان بەتاڵ بوویەوە چونکە دەسەڵاتی عەقڵ دەسەڵاتی هەستی بە درۆخستەوە. ئەو بەوە نموونە دێنێتەوە کە زۆرجار هەستەکانمان حوکم دەدەن بەرهەست (محسوس) لە سەر حاڵێك و بارێکی دیاریکراوە، بەڵام هەر زوو دەسەڵاتی عەقڵ پووچەڵی دەکاتەوەو بە درۆی دەخاتەوە. ((لە کوێ متمانە هەیە بە هەستەکان کە بەهێزترینیان هەستی بینینە ؟ سەیری سێبەر دەکات و دەبینێ لە شوێنی خۆی وەستاوەو ناجوڵێت و

[1] الغزالي، حجة الإسلام محمد بن محمد – المنقذ من الضلال، مکتبة الجندي ، القاهرة ، ١٩٧٢، ص ٨٦.

بڕیار بە نەجوولآن دەدات، پاشان بە ئەزموون و بینین دوای ماوەیەك بۆی دەردەکەوێت و دەزانێ جوولآوەو جوولآنەکەشی بە یەك جارو لە پڕێکدا نەبووە، بەڵکو پلە بە پلەو گەردیلە گەردیلە بووە تاوەکو وای لێهاتووە حاڵەتی وەستانەکە نەماوە. هەروەها سەیری ئەستێرە دەکات بە بچووك دەیبینێ لە چاو ئەندازەی دنیا پاشان بە بەڵگەی ئەندازەیی (هندسی) بۆی دەردەکەوێت کە ئەستێرەکە ئەندازەی لە زەوی گەورەترە، ئەمەو نموونەکانی تری هەستەکان دەسەلآتی هەست بڕیارەکانی خۆی تیایاندا دەردەکات و دەسەلآتی عەقڵیش دێت بە درۆی دەخاتەوە و بە ناپاك لە قەڵەمی دەدات و وا بەدرۆی دەخاتەوە هیچ ڕێگایەك نامێنێتەوە بۆ بەرگری لێکردنی))[1].

پاشان غەزالی متمانە بە وەهم و خەیاڵ و تەقلیدیش ناکات و پێی وایە ئەمەی دوایی بە زانستی یەقین و مەعریفەی دڵنیایی هەژمار ناکرێت، غەزالی هەروەك گومانی لە توانای هەست دەکرد، بە هەمان شێوە گومانی لە توانای عەقڵیش کرد کە بتوانێ بیگەیەنێت بە یەقین و لەو گێژاوە ڕزگای بکات.

بۆیە دوای ماوەی دوو مانگ لە گومان و نەگەیشتنە زانستی یەقین و دڵنیایی تەواو، خوای گەورە ڕزگاری کرد و پێویستیە عەقڵیەکان بە ماقووڵ و متمانەپێکراو بۆ لای گەڕنەوە بە یەقین و دڵنیایی تەواو، ئەمەش وەك خۆی دەڵێ بە هەوڵ و کۆششی خۆی نەبووە (بل بنور

---

[1] الغزالي – المنقذ من الضلال – سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩.

قذفه الله تعالي في الصدر، و ذلك النور هو أكثر المعارف فمن ظن أن الكشف موقوف علي الأدلة المحررة فقد ضيق رحمة الله تعالي الواسعة)[١]. واتە: بە هۆی ئەو ڕووناکیەوە بوو کە خوا خستیە نێو سنگیەوە، ئەو ڕووناکیەش زۆرترینی زانینەکانە جا گەر کەسێك وا گومان ببات کە دۆزینەوەی ڕاستی وەستاوەتە سەر بەڵگە ئازادکەرەکان ئەوا میهرەبانی فراوانی خودای بەرتەسك کردۆتەوە. بەم شێوەیە غەزالی بە ڕێگەی حەدس و خۆڕسکی یان (فطري) لە گومان و دوو دڵییەکەی ڕزگاری بوو. (فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ)[٢]. واتە: جا هەر کەسێك خوا بیەوێت ڕێنمایی بکات و بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست ئەوا سنگی گوشاد دەکات بەرەو ئیسلام.

لەم گەشتە شکگەراییەی غەزالی چەند شتێك روون دەبێتەوە:

١ـ غەزالی بە هەستی فیتری خۆی گەڕاوە بەدوای ڕاستیدا، واتە ئەوەی غەزالی دواتر پێی گەیشت هیچ کات لێی دانەبڕابوو، بەڵکو بە میتۆدی گومانی خۆی زیاتر یەقینی پەیدا کرد، بەڵکو پێش گومانەکەی و کاتی گومانەکەی و دوای گومانەکەشی هەر باوەڕدار بووەو ئیمانی نەلەرزیوە.

---

1 هەمان سەرچاوە، ل ٣١.

2 سوڕەتی ئەنعام، ئایەتی (١٢٥).

٢ـ  پێناسەی زانست لای ئەو پەیوەستە بەو هەستە فیترى و خۆڕسکییەوە، ئەو زانستەی کە پێویستە بەدەست بێت و مرۆڤ بگەیەنێت بە یەقین.

٣ـ  ئەزموونکردنی هەموو ئەو زانیاریانەی بە دەستی هێنابوون لە سەر بنەمای پێناسەی خۆی بۆ زانست و مەعریفە.

٤ـ  دۆزینەوەی ئەوەی کە هەرچی بە دەستی هیناوە لە زانست و زانین متمانەی پێ ناکرێت و جێی دڵنیایی نییە.

٥ـ  لە ئەنجامی بەراورد کردنی شتە بەرهەستەکان بە شتە ماقووڵەکان (هۆشپەسندەکان) گومانی قووڵ بوو لە توانای هەر یەکە لە (هەست و عەقڵ) لەوەی بتوانن راستی بدۆزنەوەو بیگەیەنن بە یەقین[١].

٦ـ  ئەزموونی غەزالی بە میتۆدێکی فەلسەڤی بەهێز و وەڵامدەرەوەی گومانی ڕەها دادەنرێت، چونکە سەرەتا عەقڵی و هەستییەکانی گێڕا بە متمانە پێکراو بۆ بەڵگەو سەلماندنی ئەوەی کە ڕاستی خۆی بوونی هەیەو دەکرێ بزانرێت و بەدەست بهێنرێت بەڵکو تیایدا بگەیت بە یەقین[٢].

دواجار پێویستە ئەوە بڵێین کە سەرەڕای هەوڵ و کۆششی زۆر و گەڕانی بە دوای ڕاستی دا، غەزالی پاش دەرچوونی لە گومان و بەیەقین گەیشتنی هەرهەمان غەزالی بوو کە پێشتر هەبوو، هەمان باوەڕو ئیمانی

---

[1] د. محمد محمد الحاج حسن الكمالي – سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥١ – ١٥٢.

[2] د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٧.

دامەزراوی هەبوو، واتە هیچ شتێکی لە ڕاستی نەگۆڕی و متمانەیەکی زیاتری بە عەقڵ و هۆشی ئەو نەدا جگە لەو ئاتاج و پێویستیەی لە دەروونی غەزالی دا بوو و بەجێی هێنا، بۆیە پێویست نییە کەس بەو ڕێگە پڕ کەندو لەندەدا بڕوات بۆ گەڕان بە دوای ڕاستیدا، ڕاستە بە کارهێنانی عەقڵ و گەڕان بە دوای زانست و مەعریفەدا کارێکی گرنگ و فەرمانپێکراوە، بەڵام هەرگیز ڕێبازی پێغەمبەر (درودی خوای لە سەر بێت) و یاوەران و شوێنکەوتوانی بەم شێوەیە نەبووەو گومان نەکەوتۆتە دڵیانەوە، بەڵکو پاش باوەڕبوون بە یەقین و دڵنیایی تەواو و ئاسوودەیی و سەقامگیری دەروونی هەڵسوکەوتیان کردووەو بە هیچ شێوەیەك گومانیان نەکردووە لەو زانین و مەعریفەو یەقینەی بەرخوردار بوونە لێی.

## دووەم: ڕێبازگەلی یەقین و توانای مەعریفە

فەیلەسوفەکان لە ڕەوتی گرینگیدانیان بە بابەتەکانی مەعریفەو زانین، چەند پرسیارێکیان سەبارت بە سروشتی مەعریفە وروژاند لە چەشنی: مەعریفە چییە؟ و چۆن مرۆڤ پەی دەبات بە شتەکان و توانای زانین چۆن و بە چ رادەیەکە؟ وەڵامی پرسیارەکان چوون یەك نەبووەو جیاواز بووە، هەر بۆیە لەو بارەوە چەند ڕێبازێك سەریان هەڵداوە، بەم شێوەیە:

## أ– ڕێبازی واقیعی (ئەزموونگەرایی):

ڕێبازی واقیعی یان ئەزموونگەرایی بەو ڕەوتە فەلسەفیانە دەوترێت کە لە خاڵێکی جەوهەریدا هاوبەشن ئەویش بریتییە لە جەختکردن لە بوونی جیهانی دەرەکی یان ئەو شتە دەرەکیانەی بوونی واقیعی و سەربەخۆیان هەیە لەو مرۆڤانەی پەییان پێدەبات. ڕێبازی واقیعیش دوو وێنەی هەیە:

یەکەم: واقیعگەرایی سادە: لایەنگرانی پێیان وایە جیهانی دەرەکی یاخود ئەو شت و واقیع و راستیانەی لە دەوروبەرمان هەن، بوونێکی واقیعی سەربەخۆیان لە خودی ئێمە هەیە و، ئەو شتانە بەو بناغەو بنچینەیە هەژماردەکرێن کە مەعریفەی لێ وەردەگرین، زانینی ئێمەش شتێك نییە جگە لە وێنەیەکی هاوڕێك (مگابق)ی ئەو بنچینەیە بێ زیادو کەم. واتە مرۆڤ لێرەدا رۆڵێکی لەو مەعریفە بەدەستهێنانەدا نییە، بەڵکو مرۆڤ وەك ئامێری وێنەگرتن (کامێرا) وایە کە وێنەیەکی دەقاودەقی شتە بنچینەکە دەگرێت وەك ئەوەی هەیە بێ هیچ هۆشیاری و بیرکردنەوەیەك[1].

دووەم: واقیعگەرایی رەخنەیی: لایەنگرانی پێیان وایە پرۆسەی مەعریفە (زانین) رۆڵی چالاکانەی زەین یان عەقڵ لە خۆ دەگرێت، ئەمەش تاقیکردنەوە یاخود پشکنینی رەخنەییانە دەگرێتەوە کە پشت دەبەستێ بە یاساکانی زانستە سروشتیەکان، واتە مەعریفە لای واقیعگەرایی

---

[1] د. نبیل عبدالحمید عبدالجبار – سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤. د. حربي عباس عطیتو و د. موزة محمد عبیدان – سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٥.

ڕەخنەیی درککردنی وێنەی هاوڕێك و دەقاودەقی ئەو شتانە نییە کە مرۆڤ لە دەرەوە پەی پێبردوون، بەڵکو مەعریفە وێنەیەکی گۆڕدراوە لە سایەی عەقڵەوە کە دەتوانێت شتە هەندەکی (الجزئیات) یە هەستپێکراوەکان ببڕێت و بەرەو شتە هەمەکیەکان (الکلیات) هەنگاو بنێت[1]. وەکو ئەوەی (جۆن لۆك)ی فەلسەفەکاری ئینگلیزی (١٧٣٢ – ١٨٠٤ز) جەختی لە سەر دەکردەوە، لۆك ئەوەی ڕەتکردەوە – لەگەڵ داننانی بە توانای بەدەستهێنانی مەعریفەدا – کە ڕاستییە ساناو پرەنسیپە ئاشکراو ڕوونەکان بۆ خۆڕسکی عەقڵ بگەڕێنێتەوەو ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەزموون تاکە سەرچاوەی هەموو مەعریفەیەکە و هزریش کاتێك دێتە بوون کە لە ژێر کاریگەری بابەتە دەرەکییەکاندایە وەختێك ڕاستەوخۆ هەستەکان دەکەونە ژێر کاریگەری، یاخود لە ڕێگەی بیرکردنەوەو تێڕاماندا.[2]

کەواتە واقیعگەرایی ڕەخنەیی دان بە توانای زانین و مەعریفەدا دەنێت و پێی وایە مرۆڤ دەتوانێ شتە دەرەکییەکان و بابەتە دەرەکییەکان بزانێت، بەڵام مەرجی تێپەڕبوون بە ڕێگای ئەزموون (التجربة)دا بۆ ئەو زانینە دادەنێت.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوەش بدەین کە لە پاڵ واقیعگەرایی ڕەخنەیی، وێنەیەکی تریش هەیە پێی دەوترێت واقیعگەرایی نوێ (Neo – Realism) کە سەرهەڵداوی ئینگلیزەو ئاراستەیەکی ڕەخنەیی هەیەو هەڵوێستێکی دژکارانەی لە میتافیزیکیا وەرگرت و پێی

1 د. عبدالرحمن بن زید الزنیدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٣.

2 ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل – سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٧ – ١٥٨.

وایه هیچ شتێك له سەرووی سروشتەوە نییەو وا دەڕوانێتە مەعریفە كە ئەویش وەك هەموو رووداوێك شتێكی سروشتییە. لە پێشەنگانی ئەم ڕێبازە نوێیە: مۆڕ، برتراند ڕسل، هوایهد، ئەلكسندەر و بڕوود و هی تریش[1].

**ب – ڕێبازی ئایدیالی (المذهب المثالي):**

گەرچی چەند وێنەو جۆری ئایدیالی بوونیان هەیەو جیاوازییەكی زۆر هەیە لە نێوان فەیلەسوفە ئایدیالیەكاندا، بەڵام دەتوانین بڵێین هەموویان لە یەك مانادا بە یەك دەگەن ئەویش دەستپێكردنە بە هزر پێش شت، بەمەش ئایدیالی لە بەرامبەر واقیعگەراییدا دەوەستێت.

ئایدیالیەكان نكوڵی لەوە دەكەن كە مەعریفە پەیبردنێكی دەقاودەق و هاوڕێكی شتە پەیپێبراوەكان بێت و، نكوڵی لەوە دەكەن كە ئەو شتانە بوونی سەربەخۆیان لەو عەقڵە هەبێت كە پەییان پێدەبات، بۆیە بە بڕوای ئایدیالیەكان بوونی شتەكان دەوستێتە سەر ئەو هێزانەی پەییان پێدەبەن، كەواتە ئەو شتانە تەنیا چەند وێنەیەكی عەقڵین و بەس[2]. لێرەدا ڕێبازی ئایدیالی دان بە بوونی شتێكدا نانێت لە دەرەوەی عەقڵ و پێی وایە تەنیا ئەو شتە بوونی هەیە كە عەقڵ پەی پێ دەبات و ئەگەر عەقڵ پەی بە شتێك نەبرد مانای وایە بوونی نییە.
باركلی ڕاڤەی بوون (الوجود) دەكات و پێی وایە بریتییە لە پێزانین

---

1 د. حربي عباس عطيتو و د موزة محمد عبيدان – سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٨ – ٢٠٩.
2 د. عبدالرحمن بن زيد الزنيدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٣ – ٨٤.

(الإدراك) و دەڵێت: بوونی شتێك پەی پێبردنیەتی و ئەو شتە بوونێکی سەربەخۆی لە پەیپێبردنی من نییە، ئەو دیدگاکەی خۆی بە (نا ماددەگەرایی) ناوزەد کردووە[1].

لەولاشەوە فیشتە (١٧٦٢ – ١٨١٤ز) دەڵێت: (سروشت بریتییە لە پێکهاتەیەك بە هۆی یاساکانی هزری خۆیەوە و لەوە تێپەڕ ناکات کە پەیوەندی نێوان خۆی و خودی خۆیەتی –دەرروونی خۆی –.. بەڵام سەبارەت بە جیهانی دەرەکی، ئەوە دەگاتە ئەو باوەڕەی کەس لە توانایدا نییە بەڵگەیەکی لە سەر بێنێت..)[2].

ئەوەی دیارە لە ڕێبازە ئایدیالیستەکان ئەوەیە کە هەموویان لە جیهانی واقیع دوورکەوتوونەتەوە و بەبێ بەها سەیری جیهانی بەرهەست و بینراو (عالم الشهادە) یان کردووەو بوونی بابەتیانەی شتەکانیان تەنها بە ئاراستەی هزر و بیرو خەیاڵدا بردووە.

گەرچی هەندێکیان لەوانە – بارکلی – پەییان بردووە بە سەربەخۆیی شتە پەیپێبردراوە هەستییەکان لەو عەقڵەی پەییان پێدەبات و بەوە راڤەیان کردووە کە ئەو شتانە لە عەقڵی خودایيدا بوونیان هەیەو عەقڵی بەشەریش لەوەوە وەریان دەگرێت، ئەو نموونە بەوە دێنێتەوە کە ئەگەر من چاوی خۆم لە ئاست ئەو سفرەو خوانەدا نووقاند کە لە بەردەممایەو دەستم لێی نەدا، مانای وانییە کە بوونی

---

[1] کریستۆڤەر هامیلتۆن – مەعریفەتناسی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە بۆ کوردی: بەڵێن ئەنوەر عەلی، دارالمعرفة، بیروت، ٢٠١٢، ل ١٢٠.

[2] ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٣ – ١٦٤.

نییە، چونکە  گەر وا بێت بوونی جیهانی دەرەکی تەنیا دەبێتە وەهم و خەیاڵێك و هیچی تر، بەڵام نەخێر ئەم جیهانە بوونی هەیە من چاوم بنووقێنم یان نا، ئەمەش لە بەر ئەوەی لە عەقڵێکی گەورەتردا کە لە خۆی گرتووە بوونی هەیە کە عەقڵی خوداییە یان خودایە[1].

کانت (١٧٢٤ – ١٨٠٤.)یش لەو ئایدیالیانەیە[2] کە دان بە بوونی حەقیقەت و توانای مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە و زانیندا دەنێت[3]، بەڵام بە لای ئەوەوە ئەو حەقیقەتە یان ئەو مەعریفەیەی مرۆڤ دەکارێ پەی پێ ببات و بیزانێت حەقیقەت یان مەعریفەیەکی ڕێژەییە و ڕەها نییە و، ئەو پێی وایە حەقیقەتی بابەتی لە تێڕامان لە لایەنی خودی جیا ناکرێتەوە، بەمەش کانت پێچەوانە بوو لە گەڵ ئەزموونگەرایی و عەقڵگەراکان و رەخنەی لێگرتن و هەوڵیدا پێکەوە کۆیان بکاتەوە. بە کورتی ڕێژەیی بوونی مەعریفە لە ئایدیالیزمی ڕەخنەیی بریتییە لەوەی کە دەڵێن ئێمە ناتوانین هەموو شتێك بزانین، ئەگەر هەندێ شتیشمان زانی ناتوانین بە تەواوی بیانزانین. بە واتایەکی تر شتەکان بە پێی

---

[1] د. محمد محمد الحاج حسن الكمالي – سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٨.

[2] ئەم جۆرە لە ئایدیالیەت بە ڕێبازی واقیعی یان ئاراستەی واقیعگەرایی–یش ناودەبرێت.

[3] سەبارەت بەم بابەتە بڕوانە: د. راجح عبدالحميد الكردي – سەرچاوەی پێشو، ل ١٤٢ – ١٤٥، د.مصطفى حسن النشار، أعلام الفلسفة حياتهم و مذاهبهم، دارالمسيرة، عمان، ١٤٣٢ هـ – ٢٠١١م، ل ٢٥٧و دواتری. لئو راوچ – فلسفه هگل، ترجمه: عبدالعلى دست غيب، نشر پرسش، اصفهان ، ١٣٨٢ ھ ش، ل ٢١ و دواتری.

باوەڕی کانت بە ڕواڵەت زانراون، بەڵام لە خودی خۆیاندا نادیارن، بەمەش ئایدیالیزمی رەخنەیی کانت دەبێتە ئایدیالیزمێکی دوانەیی یان دوولایەنی، بەڵام رەخنەی لای کانت وەك ئەو گومانە ناگەیەنێت کە (دیکارت) لێیەوە دەستی پێکرد، چونکە (دیکارت) لە گومانی ڕەهاوە دەستی پێکرد، بەڵام (کانت) لە ئەزموونەوە دەستی پێکرد.

دەتوانین بڵێین کانت لە نێوان گومان و یەقین وەستاوە، بەمەش شێوازێکی رەخنەیی گرتۆتە بەر کە وەستاوەتە سەر لێکۆڵینەوە لە تواناکانی عەقڵ و توانای دیاریکردنی ئەو پرسیارانەی دەکرێ مرۆڤ بیان وروژێنێت و وەڵامیان بداتەوە.

بەڵام فریدریك هێگڵ (١٧٧٠ – ١٨٣١ز) مامۆستای کارڵ مارکس (١٨١٨ – ١٨٨٣ز) رێبازی ئایدیالیزم دەکاتە فەلسەفەی خۆی، وەلێ قوتابیەکەی فەلسەفەی ماددیگەرایی پێچەوانەی مامۆستاکەی دەکاتە رێبازی خۆی. ئایدیالیزمی ڕەها (المثالیة المطلقة) پێی وایە عەقلێکی ڕەها یان خودایی لە سروشتدا بوونی هەیەو ئەو عەقڵە خوداییە لە سروشتدا پەنهانە، سروشتیش لە جووڵەو پەرەسەندنیدا ملکەچە بۆ ئەو ڕەها (المطلق)یە. واتە لای هێگڵ ڕەها بە مانای هزرێکی ڕەها (خودا) بەدیهێنەری ماددەیە و هزریش بەرهەمی ماددەو ڕەنگدانەوەی جووڵەی ماددە نییە لە مێشکی مرۆڤدا، لێرەدا هزری ڕەها لای هێگڵ باوەڕێکە، بۆیە دیالێکتی هێگڵ لە یەك کاتدا میتۆد و ڕێبازیشە. بەڵام مارکس دێت لە دیالێکتی هێگڵ میتۆد (المنهج)ەکە وەردەگرێت و ڕێباز (المذهب)ە کە دوور دەخاتەوە لە سەر بنەمای ئەوە کە گوایە تەسەوری یە، بۆیە

مارکس بە توندی هێرش دەکاتە سەر فەلسەفەی هێگڵ و پێی وایە میتۆدی ئەو ڕێك پێچەوانەی میتۆدی (هێگڵ)ە، چونکە بە باوەڕی مارکس هێگڵ باوەڕی وایە کە جووڵەی هزری و فکری کە ئەو بە ناوی هزری ڕەها بەرجەستەی دەکات بەدیهێنەری ئەو واقیعەیە کە شتێك نییە جگە لە وێنەیەکی ڕواڵەتی هزرەکە (Laforme phe nomenale)، بەڵام من بە پێچەوانەوە باوەڕم وایە کە جووڵەی هزر تەنیا بریتییە لە ڕەنگدانەوەی بزاڤی یان جووڵەی واقیع کە گوازراوەتەوە بۆ زەینی مرۆڤ[1].

لە بەشی پێنجەمدا دێینە سەر هەڵوێستی قورئان لە مەڕ توانای مەعریفەو زانین و ڕێبازەکانی گومان و یەقین.

---

[1] د. أحمد إبراهيم الورتي – مشاريع الإصلاح في الشرق الأوسط، ط١، دارالزمان، دمشق، ٢٠١٢، ل ٧٦ – ٧٧.

## هەڵوێستی قورئان بەرامبەر ڕێبازگەلی گومان و یەقین

مەسەلەی توانای بەدەستهێنانی مەعریفە (إمكان المعرفة) وەك کێشەیەکی فەلسەفی قورئان زۆر گرنگی پێنەداوە بەو شێوە گرنگیدانە رووتەی لە هزری فەلسەفی دا قسەی لەسەر دەکرێت و ئەمەش لەبەرئەوەی کە گومانکردن لەوەی ئایا مرۆڤ دەتوانێ شت بزانێ یان نا، ئایا دەتوانێ پەی بە ڕاستی شتەکان ببات یان نا پێچەوانەی سروشتی پەیامی قورئان و پێچەوانەی سروشتی خۆڕسکی (فطري) مرۆڤیشە کە خودا دروستی کردووەو بە هۆی زانست و زانین و عەقڵ و توانای لێکجیاکردنەوەی شتەکان (چاك و خراپ، سپی و ڕەش..) و فێربوونەوە، لە دروستکراوەکانی ترجیای کردۆتەوەو بەرپرسیاری کردووە، ئەم بەرپرسیارێتی و (تكليف)ە لە مرۆڤ دا بۆخۆی زانست و زانینە، تەنانەت باوەڕ و ئیمان مەعریفەو زانینە، چونکە بنەمای رەفتار و مامەڵەی مرۆڤە لە گەڵ خوداو ودەوروبەریدا.

پێچەوانەی سۆفیستەکان کە نکوڵی لە راستییە بابەتیەکان دەکەن[1]، حەقیقەتی شتەکان سەلمێنراوە لە جیهانی دەرەکی دا و دەتوانرێ پەییان پێ ببرێت، زانستی مرۆڤیش رێژەییە (وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا)[2]. واتە: شتێکی کەم نەبێ لە زانست و زانین پێتان نەدراوە. هەروەها ناردنی پێغەمبەران بەڵگەیە لە سەر ئەوە کە مەعریفە

---

[1] لە پێشەوە باسمان لەم بابەتە کرد. هەروەها لەو بارەوە بڕوانە: سعدالدين التفتازاني – شرح العقائد النسفي المحشي، ط٢، انشارات سيديان، ١٣٥٢ هـ ش، ص ١٠ وما بعدها.

[2] سوڕەتی ئیسرا، ئایەتی (٨٥).

مەحاڵ نییە پەی پێ ببرێت و بزانرێت، چونکە گەر مرۆڤ توانای زانینی تیا نەبێ، چۆن پێغەمبەری بۆ دەنێردرێت و پەیامی خودایی ئاراستە دەکرێت تا بیزانێت و لێی تێبگات تاوەکو کاری پێبکات.

قورئانیش هانی مرۆڤ دەدات بۆ بیرکردنەوەو تێڕامان لە بوونەوەر و بە کارهێنانی هەستەکانی و عەقڵ و ژیری بۆ فێربوون و دۆزینەوەی ڕاستی.

ئەمانە هەمووی بەڵگەن لە سەر توانای مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی مەعریفەو زانین.

لێرەدا (٤) توخمی مەعریفە بوونیان هەیە:

١ـ مرۆڤ کە شتەکان دەزانێ و پەییان پێدەبات.

٢ـ بابەتی مەعریفە (ئەو شتەی پەی پێ دەبردرێت).

٣ـ گۆڕەپانی مەعریفە (کە هەردوو جیهانی بینراو و نەبینراو – عالم الشهادة وَعالم الغیب) دەگرێتەوە.

٤ـ ڕێگاکانی زانین و مەعریفە یان هۆکار و ئامرازەکان لە (هەست و عەقڵ و سروش– الوحی).

بۆیە لە ڕوانگەی قورئانەوە گومان و دوو دڵی نەزانینەو باوەڕو ئیمانیش زانست و زانینە، واتە ئەسڵ یەقین و دڵنیایی و باوەڕبوونەو گومانکردن دەرچوونە لە فیترەت و خۆڕسکی، بۆیەش قورئان سەرزەنشتی شککەراکان دەکات ئەوانەی مەبەستیان لە گومان و شککەرایی وەستان و بێ باوەڕی و نازانمکاری و پەککستنی بزاڤی ژیان و عەقڵە.

سەبارەت بە گومان و شکگەرایی مشتومڕێکی زۆر بەرپاربووە لە هزری ئیسلامیی دا بە تایبەت دەربارەی ناسینی خودا کە ئاخۆ پێویستە بە قۆناغی گوماندا گوزەر بکات یان نا؟

ئەگەر کێشەکە لەوەدا بێت کە ئایا مەعریفە پێش بوونە یان بوون پێش مەعریفەیە کە وەك جەدەلێکی فەلسەفی وروژێنراوە، ئەوا قورئان ئەم مەسەلەیەی یەکلاکردۆتەوە کە مەعریفە بە دوای بووندا دێـت، واتە مەعریفە پەکی لە سەر بوون کەوتووە نەك بوون پەکی لە سەر مەعریفە کەوتبێت.

بێگومان شکگەرایی ڕەها خۆی ڕەتکراوەیەو بای ئەوە نییە کاتی پێوە بە هەدەر بدرێت، بەڵام سەبارەت بە شکگەرایی میتۆدی (الشك المنهجی) کە هەندێ لە فەیلەسوفان پیایدا ڕەت بوونە لە وانە غەزالی و دیکارت و هێگڵ، ئەوا ناتوانرێت پەسند بکرێت و پاساوی بۆ بهێنرێتەوە هەرچەند خاوەنەکەی بانگەشەی ئەوە بکات کە چەند بەڵگەو دەلیلێك هەن دەیانگەیەنن بە یەقین لە باوەڕو ئیمانەکەی یان بە داننان بە بوونی شتەکان، چونکە وەسیلەیەکی متمانەپێکراوی تەواوی نییە دڵنیابێ لەوەی لە سەر ڕێگەی راستەو دەیگەیەنێ بە یەقین، ئەوەتا (دیکارت) هەست دەکات شەیتان فریوی دەدات و گومانی تەنانەت لە حەقیقەتی ئاشکراو جیا کە خودایە بۆ دروست دەکات، لەم فریودان و گومانەش رزگای نابێت تاوەکو دان نەنێت بە بوون (الوجود) پێش ناسینی حەقیقەتە گەورەکە، کە ئەویش خودایە کە هیچ فریودان و هەڵخەڵەتاندنی نییەو گرەنتی ڕاستی و دڵنیاییە.

گریمان گومانی میتۆدی ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە یەقین، ئەوا مرۆڤ لە ڕێگەی عەقڵ و هەست کێشەکەی بۆ چارەسەر نابێت، چونکە غەزالی و دیکارت پەنایان بردە بەر هێزێکی سەرووی عەقڵ بۆ دۆزینەوەی ڕاستی یان گەیشتن بە یەقین کە ئەویش بریتییە لە حەدس یان ئەو ڕووناکیەی کە خودا دەیخاتە دڵەوە.

خۆ ئەگەر ئەم گومانە ڕێگایەکیش بێت بۆ گەیشتن بە یەقین، تاکە ڕێگە نییە وەك خاوەنەکانیان بانگەشەی بۆ دەکەن، چونکە ئەم ڕێگایە هەم پێچەوانەی فیترەت و پاقژی مرۆڤە و هەمیش ئاڵۆزی دروست دەکات و شتی سانا سەخت و زەحمەت دەکات، هەموو خەڵکیش ناتوانن بەو ڕێگا فەلسەفیەدا گوزەر بکەن و ڕێگای دوور و درێژ و سەخت بگرنە بەر بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی ڕۆشن، چونکە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە غەزالی دوای ئەو ماوەیە کە بە ماوەی گومانکردن دادەنرێت گەڕایەوە سەرەتاو هیچی زیاد نەکرد، واتە ئەو پێش گومان و کاتی گومان و دوای گومانەکەشی هەروەك خۆی بوو و ئیمانەکەی جێگیر بوو.

هەندێکیشیان[1] پێیان وایە دەکرێ بگوترێت هەندێ جار ئەم جۆرە گومانە گومانێکی ڕواڵەتی دروستکراوە لە لایەن گومانکارەکە، وەکو گومانی (دیکارت)، هەندێ جاریش گومانێکە بە شێوەی ناچاری ڕووی لە مرۆڤ کردووە، وەکو گومانەکەی ئەبو حامیدی غەزالی.

---

[1] د. عبدالرحمن بن زيد الزنيدي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٠.

هەندێکیش پێیان وایە گومان لای هەموو زاناو بیریارێك هەیە، تەنانەت لای پێغەمبەرانیش هەبووە، وەك لە قورئان هاتووە: (أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَي وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي)[1]. واتە: کاتێ ئیبراهیم وتی: خودایە پیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە، خوداش پێی فەرموو: مەگەر تۆ ئیمانت نەهێناوەو باوەڕت نییە؟ ئیبراهیم وتی: بەڵێ باوەڕم هەیە، بەڵام حەزدەکەم دڵنیابم و دڵم ئاو بخواتەوەو ئۆقرە بگرێت.

واتە: قورئان رێگە لەوە ناگرێت مرۆڤ رێگەیەك بگرێتە بەر بڕوای بەهێزترو زیاتر بکات و پلەی یەقینی بەرزبکاتەوە، ئەمەش بە قووڵبوونەوە لە بابەت و زانیارییەکان و پاڵفتەکردنی ئامرازەکانی مەعریفە بە گومانکردن تیایاندا، ئەگەر گومانی باش ببەین بە غەزالی دەبێژین ئەویش ویستوویەتی ئەو قۆناغە لە ئیمان و باوەڕ بەرەو یەقین و پلەی دڵنیایی تێپەڕێنێت.

بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە داواکردنی ئیبراهیم (سڵاوی خوای لە سەر بێت) لە خودا بۆ پیشاندانی چۆنیەتی زیندووکردنەوەی مردووان، لە گومانەوە سەرچاوەی نەگرتبوو، چونکە ئەو پێغەمبەری خودا بووەو خوا چاودێری کردووە، بەڵکو بۆ یەقین و دڵنیایی بووە، بە هەمان شێوەش کاتێ موسا – سڵاوی خوای لە سەر بێت – داوای بینینی خوای کرد، بەڵام کە ئەو خۆی رانەگرت بەرامبەر کێوەکە کاتێ خوا رووناکی خۆی بۆ دەرخست، موسا کەوت و بێ هۆش بوو، کە هۆشی

---

[1] سوڕەتی بەقەڕە، ئایەتی (٢٦٠).

هاتەوە بە سەردا و چاوی کردەوە وتی خودایە پاکی و بێ گەردی بۆ تۆیە (وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ)[١]. واتە: من یەکەم کەسم (لەچاو نەتەوەی خۆم دا) باوەڕم هێناوە و یەکەم باوەڕدارم. ئەمەش وەکو وتەکەی ئیبراهیم بوو کە وتی (بَلَي وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي). هەروەها لە سورەتی (ئەنعام)دا لە بارەیەوە دەفەرموێت: (وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ)[٢]. واتە: بۆ ئەوەی ئیبراهیم بە تەواوی یەقین پەیدا بکات و دڵنیابێت لەوەی باوەڕی پێیەتی.

گەرچی گومانی میتۆدی (الشك المنهجی) ڕێگایەك بێت بۆ یەقینی فەلسەفی، بەڵام وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، قورئان بایەخی پێ نەداوە وەك ئەوەی لە فیکری فەلسەفی دا بۆتە گرێ کوێرەو چارەسەر نابێت، چونکە گومانکردن لە هەستەکان و عەقڵی لێدەکەوێتەوەو سەرەتا پەکیان دەخرێت، بەڵام قورئان کاتێ ئامانج لە دروستکردنی مرۆڤ دیاری دەکات کە خودا ناسییە: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)[٣]. واتە: من جنۆکەو مرۆڤم دروست نەکردوون مەگەر بۆ ئەوە نەبێ کە بمپەرستن. عەقڵ و هۆشی کردۆتە مەرجی ئەو ئەرك و بەرپرسیارێتییە، گەر عەقڵیش لە کارخراو پەکی کەوت یان گومان لە توانا و زانین و پەیبردنی بە شتەکان دروست کرا، بیرکردنەوە و تێڕامان و گەڕان بە دوای زانست و زانیاری و گەیشتن بە ڕاستی و یەقین، هەمووی دەکەوێتە

---

1 سورەتی ئەعراف، ئایەتی (١٤٣).

2 ئایەتی (٧٥).

3 سورەتی ذاریات، ئایەتی (٥٦).

ژێر پرسیارو بە مەش کێشەیەکی گەورە روو لە مرۆڤ دەکات، تەنانەت پەرستنی خوداش بە بێ مەعریفە و ناسینی ئەو بە ئەنجام ناگات.

هاوڕاین لە گەڵ د. راجح کوردی کاتێ باس لەم مەسەلەیە دەکات و دەڵێ: (لە راستیدا هاتنە ناوەوەی میتۆدەکانی گومان بۆ نێو هزری ئیسلامیی تەنانەت گەر میتۆدی (منهجی) ش بێت مەترسیدارە لە سەر بیرکردنەوەو میتۆدی مسوڵمانان لە بواری مەعریفە و زانین دا. رەنگە غەزالی ئەم میتۆدەی بە کاریگەری خوێندنەوە فەلسەفەییە زۆرەکانی لە یۆنانی کۆن و رێبازگەلی فەیلەسوفە مسوڵمانەکان داڕشتبێت. بەڵکو لەوانەیە فەیلەسوفە مسوڵمانەکانی پێش خۆی وەکو کیندی و فاڕابی و ئیبن سینا – لە مەسەلەی توانای بەدەستهێنانی مەعریفەدا – لەو پارێزکارانە ترو بە ئیحتیاتتر مامەڵەیان کردبێت و نەیان وروژاندبێت و، تیایدا باوەڕدارو دڵنیا و یەقیندار بوونە، بەڵکو ئیبن سینا ئاماژەی بەوە کردووە کە مرۆڤ بە هەستی بەدیهی خۆی هەست بە بوونی خۆی دەکات، بە بێ هیچ گومانکردنێکی ڕەها یان میتۆدی.. [1]).

کەوابوو ناکرێ تاکە سەرچاوەی مەعریفە و گەیشتن بە (یەقین) ئەم رێگایە بێت، بە تایبەت ئیمان و باوەڕێك کە قورئان داوای دەکات ئەم رێگای گومانەی بە مەرج نەگرتووە، بەڵکو رێگاکان زۆرن بۆ گەیشتن بە یەقین، لە وانە رێگای فێر بوون و هەستی خۆڕسکی و هۆش و هۆشیاری و تێڕامان و بەڵگەخوازی (الإستدلال).

---

[1] بڕوانە: د. راجح عبدالحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٣.

ئەتوانین بڵێین زۆربەی فەیلەسوفەکان لەم مەسەلەیەدا بە هەڵەدا چوونەو نەیانپێکاوە، چ ئەوانەی زێدەڕەویان لە توانای عەقڵدا کردووەو چ ئەوانەی رۆڵی هەستەکانیان پەکخستووە، ئیتر بەمەش کەوتوونەتە تەنگژەوەو کەمێکیان نەبێ لێی دەرنەچوونە بەتایبەت ئەوانەی رێگەی بێ باوەڕیان گرتۆتەبەر، مەسعود عەبدولخالق وتەنی: (دەتوانین بڵێین فەیلەسوف و رۆشنبیرە مولحیدەکان لە لێوار خنکاون و زۆریان لە فەلسەفە نەزانیوە تەنها گەیشتوونەتە قۆناغی دوو و سێ، لە راستیدا ئەوانە عەقڵیان گەورە بووە.. بەڵام ئەوان ئەو عەقڵە گەورەیان بە مەنهەج و پاڵپشت بە پەیام نەبووە کە رێی دوورت بۆ نزیك دەکاتەوە و مەنهەجێکی دروستت بۆ دیاری دەکات، لەوەوە لە لێوارەکان خنکاون زۆربەشیان کەوتوونەتە بەردەستی دەسەڵاتێکی زۆرداری بە کاری هێناون..).[1]

## چارەسەری قورئانیی بۆ پرسی مەعریفە

چارەسەری قورئان بۆ مەسەلەی توانای بەدەستهێنانی مەعریفە چارەسەرێکی خودایيە، ئەویش خۆی دەبینێـتەوە لە داننان بە ڕۆڵی مرۆڤ لە مامەڵەکردنی لە گەل واقیعدا بە مامەڵە کردنێکی مەعریفیانە، مرۆڤ گەورەترین بەدیهێنراو و سەروەری گەردوون (سید الكون)ە، مرۆڤ لە گەڵ واقیعێکی دروستکراوی رامکراو بۆ خزمەتی ئەو مامەڵە دەکات

[1] مسعود عبدالخالق – رەوشی فەلسەڤ سەدەی ٢١، چ١، نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو راگەیاندن، هەولێر، ١٤٣٤ ك – ٢٠١٣ز، ل ٣٢٢.

که خوا فێری کردووه و عەقڵ و هۆشی پێداوەو تواناو لێهاتوویی و شایستەیی زانین و مەعریفەی پێ بەخشیوە.

بەم شێوەیە ئەو بۆشاییە نامێنێ و پڕ دەبێتەوە لە نێوان کەسی زانیار (الذات العارفة) و بابەتی زانراو (الموضوع المعروف)دا، (عەقڵ و هەست)یش هەردووکیان ئامرازی مەعریفەن نەك یەکێکیان، ئەو شتانەشی لە بازنەی عەقڵ و هەستەکاندا نین، لە ڕێگەی ترەوە کە ڕێگەی سروش (وحی)ە دەزانرێن، چونکە جیهانی نەبینراو (عالم الغیب) لە ڕێگەی سەلماندنی عەقڵییەوە پەی پێ نابرێت، بەڵام لە مەشدا ڕۆڵی عەقڵ و تێڕامان نادیدە ناگیرێت، بەڵکو پێچەوانەی واقیعگەرایی ڕەخنەیی – کە زانین و پەی بردن بە جیهانی نەبینراو یان میتافیزیکیا یان شتێك لە خودی خۆیدا لە ڕێگەی عەقڵی تێڕامان بە مەحاڵ دەزانێت چونکە ئەزموونی مرۆڤ سنووردارە –، ئێمە پێمان وایە عەقڵ لە توانایدایە لە میانەی یاساگەلی جیهانی بینراو (عالم الشهادة) بڕوا بە بنەمای بوونی جیهانی نەبینراو (عالم الغیب) بێنێت، بەڵام ئەزموونی هەستی و عەقڵی مرۆڤ دەستە پاچەیە لە زانین و پەیبردن بە جەوهەر و حەقیقەت و وردەکاری جیهانی نەبینراو و پەنهان[1].

ئیبن خەلدونیش ئەو بۆچوونە هەڵەیە ڕەتدەکاتەوە کە فەیلەسوفەکان پێیان وابووە بوون لای هەر درککار (مدرِك)ێك کورت دەبێتەوە لە هەست و ئامرازە درکپێکەرەکانی و دەڵێ: (بوون لەوە

[1] د. راجح عبدالحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٩.

فراونترە کە دەوری بدات کە خۆی بەشێکە لەو بوونە یان بتوانێ بە تەواوی بیزانێت و پەی پێ ببات و جەوهەر و حەقیقەتەکەی بزانێت).[١]

چارەسەری قورئانیی چارەسەرێکی واقیعییە، چونکە مرۆڤ تەنیا لە بازنەی ماددیگەرایی دا ناهێڵێتەوەو بەرزی دەکاتەوە و ڕێزی لێدەگرێت، داواشی لێدەکات عەقڵ و هۆشی بخاتە کارو مەعریفە بە دەست بێنێت و لە ڕێگەی عەقڵ و هەستەکان و ڕێگەی سروش (وحی)ەوە زانست و زانیاری فێر ببێت.

بەم شێوەیە چارەسەری قورئان چارەسەرێکی ریشەیی و گشتی و هاوسەنگە، لە گەل ئەوەشدا کە مرۆڤ توانای زانین و بەدەستهێنانی مەعریفەی هەیە، بەڵام توانای سنووردارەو ڕێژەییەو قورئان جەختی لە سەر دەکاتەوە: (وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا)[٢]. واتە: کەمێك نەبێ لە زانست و زانیاری پێتان نەدراوە. (وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ)[٣]. واتە: لە ژوور هەر زانایەکەوە زانایەکی تر هەیە.

کەواتە هەڵوێستی راست و دروست و ساغڵەم کە لە گەڵ بنەماکانی ئیسلام هاوڕێکە – وەك د. عبدالرحمن الزنیدی دەیڵێت[٤] – ئەوەیە کە خوای گەورە مرۆڤی دروستکردووە لە سەر چەند بنەمایەکی فیتری کە

---

[1] عبدالرحمن بن خلدون – مقدمة ابن خلدون، تحقيق حامد أحمد الطاهر، دارالفجر للتراث، القاهرة، ٢٠٠٤، ص ٦٦٥.

[2] سوڕەتی ئیسڕاء ، ئایەتی (٥٨).

[3] سوڕەتی یوسف، ئایەتی (٧٦).

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢.

ناکرێ لە عەقڵی مرۆڤ داماڵرێن، چونکە نرخ و بەهای عەقڵ وەك سەرچاوەیەکی مەعریفە بە بوونی ئەو بنەمایانە تەواو دەبێت، بۆیە زۆر لە زانایان عەقڵیان بەوە پێناسە کردووە کە بریتییە لەو زانستە پێویستانەی سەرەتا بە دەستدێن و ئینجا گشتگیر دەبن بۆ هەموو ژێرمەندان.

نەمانی ئەو بنەمایانە و داماڵرانیان بە تەواوی واتە: لاچوون و نەمانی عەقڵ و نەمان  و لاچوونی ئەرك و (تەکلیف) کە بەندە بە بوونی عەقڵەوە و بێ توانایی لە بەدەستهێنانی زانست یا بنیاتنانی هەرجۆرە مەعریفەیەك.

هەڵوێستی زانایانی (کەلام)یش لەم رووەوە روونە کە جەختیان لە سەر ئەوە کردۆتەوە هەر یەکە لە هەستەکان و عەقڵ رۆڵ و کاری خۆیان هەیە و نە هەستەکان رۆڵی عەقڵ کۆتایی پێدێنن و نە عەقڵیش کۆتایی بە رۆڵی هەستەکان دێنێت. واتە لێرەدا هەر یەکە لە هەستەکان (الحواس) و عەقڵ کاری خۆیان دەکەن، کاتێ شتێك لە دەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی ئەواندا دەبێت، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ پەیامی خودایی تا بەرچاومان رۆشن بکات تاوەکو لە خنکان و نغرۆ بوون رزگارمان بێت. خۆ گەر ئەوانەی بە هۆی عەقڵگەرایی زیاد لە سنوور و فەلسەفە ماددیگەراکان و دەسەڵاتی ڕەهای عەقڵەوە بەهەڵەدا چوون، گەڕابانەوە بۆ خودی عەقڵی خۆیان و بە چاوێکی تیژو تێڕامانێکی راستەقینەوە بیان روانیبا لە خۆیان و دەوروبەر، دەیانزانی کە عەقڵ سنووری هەیەو

ناكرێ بۆ دەرەوەی دەسەڵات و قەڵەمڕەوی خۆی ڕەت ببێت و پەل بهاوێت گەرنا نغرۆ دەبێت.

ئەم تێڕوانینە سادەیە بۆ بوون – وەك زانای بەڕێز عبدالرحمن حسن حبنکە المیدانی – دەڵێت[1]: سەرچاوەی خراپەیەکی گەورەیە کە سەری کێشا بۆ ئەوەی هەندێ خەڵك باوەڕیان بە فیکری ماددیگەرایی بێ باوەڕی (ملحد) بێنن، کە جگە لە چێژ و غەریزە و سنووری ڕواڵەتە ماددییەکان دان بەشتێکی تردا نانێت! لە ماددیگەراکان هەندێکیان نکوڵیان لە گیان (ڕۆح) و جۆرەها دروستکراوی تر کردووە کە بە هەستەکان نابینرێن، پاشان هەندێکی تریان نکوڵیان لە بوونی خوا کرد بە پاساوی ئەوەی ئەو شتانە بە هەستەکان ناتوانرێن ببینرێن.

بێگومان هەروەك قورئان خۆی یەقینییە لە هاتنە خوارەوەیدا و شك و گومانی تێدا نییە، بەهەمان شێوە قورئان دەیەوێت ژیان لەسەر بنەمای یەقین و دڵنیایی دابڕێژێت نەك لە سەر بنەمای گومان و دوودڵی و دڵەڕاوکێ و باوەڕ بە خۆنەبوون و ئیمان و باوەڕ بوونیش بە خودای بەدیهێنەری مرۆڤ و گەردوون بنەمای (یەقین)ە.

یەقینی قورئان لەگەڵ یەقینی فیتری و خۆڕسکیدا یەك دەگرێتەوە، بۆیە قورئان قسە لەگەڵ ئەو فیتڕەتەی مرۆڤدا دەکات و دەیجووڵێنێ و دژایەتی شکگەرایی و دوژمنانی یەقین دەکات، کاتێك مرۆڤ یەقین پەیدا

---

[1] عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني – العقيدة الإسلامية و أسسها، ط٢، انتشارات بيان، پاوە، ايران، ١٣٩٩هـ – ١٩٧٩م، ص ٦٩٠.

دەکات، نابێ گوێ لە گومان و وڕێنەو خەیاڵات ڕابگرێت (وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ).[1] واتە: ئەگەر تۆ بە قسەی بەشی زۆری خەڵکی سەر زەوی بکەیت لەوانەی گومڕاو سەرلێشێواون، تۆیش گومڕا دەکەن و لە ڕێگەی خودا لات دەدەن و سەرت لێدەشێوێنن.

دەبێ پشت بە سەرەتا و پێشەکی و بەڵگەی زانستی و ڕاست و دروست ببەسترێت نەك بە گومان و نەزانینەوە بڕیار بدرێت: (وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا).[2] واتە: شوێن شتێ مەکەوە زانینت پێی نەبێ و نەیزانیت، بێگومان گوێ و چاو و دڵ هەموو ئەوانە پرسیاریان لێ دەکرێ کە خاوەنەکانیان چی پێ کردوون.

یەقینیش کە قورئان داوای دەکات و بنەمای زانست و ئەو شتە جێگیرەیە کە ئاشکراو روونە و هیچ گومانی تیا نییە، لە بیست و نۆ شوێن بە ڕێژگە (صیغە)ی جیاجیا هاتووە. یەقین لە قورئاندا تەنها بە مانا فەلسەفییەکەی نایەت کە بریتییە لەو سەلماندنە یان یەقینەی لە بەڵگەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵکو یەقین مەبەستی زانستە لە قورئان و بەرزترین پلەی زانست و زانینە کە مرۆڤ پێی دەگات و، هەندێ جار مرۆڤ بەبێ ئەوەی پێویستی بە بەڵگە هەبێت یەقین بەدەست دێنێت بە

---

[1] سورەتی ئەنعام، ئایەتی (١١٦).

[2] سورەتی ئیسراء ، ئایەتی (٣٦).

هۆشیاری فیتری خۆی و تەسلیم بوون بە پەیامی خودایی، چونکە لە روانگەی یەقینی قورئانەوە بەهای بەڵگەو دەلیل لەوەدایە کە دڵنیایی و یەقین زیاد دەکات و خودی بەڵگەو دەلیلەکە بە تەنیا یەقین زیاد ناکات بەڵکو دەبێتە هۆی زیادبوونی کاری چاکە و پارێزکاری (التقوی).[(١)]

ماوەتەوە ئەوە بڵێین کە ئایین و پەیامی خوایی ڕێ ڕوونی و ڕێنیشاندەری مرۆڤە بۆ ئەوەی بەهەڵەدا نەچێت و سەری لێنەشێوێت، دوای ئەو هەموو قۆناغەی مرۆڤ لە زانست و فەلسەفە بڕیویەتی، هێشتا پێویستی بەوەیە زەین و هۆشی خۆی پاك بکاتەوەو بە ڕێگای دروستی خۆی بە دوای زانست و مەعریفەدا بگەڕێت، چونکە لە ئیسلامدا شتێکمان نییە ناوی دژایەتی بێت بۆ زانست و مەعریفەو ئیسلام دان بە هیچ جۆرە ململانێیەك لە نێوان خۆی و زانستدا نانێت، بۆیە بۆشایی ئایینی ناکرێ و ناشێ لە دنیای ئیسلام دروست ببێت. بەڵام لە خۆرئاوادا بۆشاییەکی زۆر لەو رووەوە دەبینرێت، بۆیە وتەیەکی (پ. د. موحسین محەممەد حوسێن) دەکەینە دوماهی ئەم بەشە کە دەڵێت: ((گەورەترین کارەسات کە ئەمڕۆ هەموو جیهان روو بە ڕووی بۆتەوە، ئەوەیە کە جەماوەر – نەخاسمە لە رۆژاوادا – لە جیاتی پەیدابوونی بۆشایی ئایینی، خۆیان بە مەزهەب و "ئایدۆلۆژیا" گەلێکەوە خەریك دەکەن و بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی بە کار بردن و تێرکردنی غەریزەی خۆیان هانای بۆ دەبەن، کە لە رووی بتپەرستییەوە و لە ڕووی

---

[1] د. راجح عبدالحمید الکردي – سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٠.

تاکپەرستییەوە هیچی لە ئایینە سەرەتاییەکان کەمتر نییە، وەك تۆینبی دەڵێت: هەرچەندیشە خۆی لە ژێرپەردەی بریقەدار شاردبێتەوە و، لە شێوەی "بە ئیلاهکردنی تاکی فانی"دا خۆی دەربخات. تۆینبی، بە هەڵەیەکی گەورەی دەزانێت مەزهەبە دنیەوییەکان لە جێگەی ئایینەکان دابنرێت و دەڵێت: تێگەیشتنی ئادەمیزاد لە قانوون و ڕێساکانی سروشت و کۆنترۆڵکردنیان گرنگی بە لای ئادەمیزادەوە زۆر کەمترە لەوەی کە لایەنە ڕوحییەکەیان لەخودی خۆیدا دەوڵەمەند بکات)[1].

[1] پ. د. موحسین موحەممەد حوسێن – سروشت و مەعریفە و فەلسەفەی مێژوو، چ١، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١، ل ٢٠٧ – ٢٠٨.

# کۆتایی

لە کۆتایی ئەم باسەدا، دەمانەوێت گرنگترین ئەو ئەنجامیگریانەی پێی گەیشتووین لە میانی تاوتوێکردنی باس و خواسەکانی تیۆری مەعریفەدا، دەستنیشان بکەین:

١ـ بۆمان دەردەکەوێت کە مەعریفە وەك سیفەتێکی مرۆڤ و خەسڵەتێکی جیاکەرەوە، لە میانی پێناسەکردنی چەمکەکە و چەمکی زانست و پەیوەندییان بە یەکەوە، نەك جێگەی گومان نییە، بەڵکو زانین و پەیبردن بە شتەکان و توانای مرۆڤ بۆ زانین بەڵگەنەویستە و فامکردنی مەسەلەکەش قورس و ئاڵۆز نییە.

٢ـ گومان لە مەعریفە، بە تایبەت گومانی ڕەها (الشك المطلق) لەگەڵ فیترەتی ساغڵەمی مرۆڤ تێك دەگیرێت کە لە سەر بنەمای یەقینی بنیاتنراوە، بۆیە قبوڵکراو نییەو ڕێبازە فەلسەفییەکان تیایدا ڕوو بە ڕووی سەرلێشێوان و خنکان بوونەتەوە.

٣ـ گومانی میتۆدی ڕێگایەکی دروست و لۆژیکی نییە بۆ گەیشتن بە یەقین، گەرچی دەگوترێ ئەم گومانە قۆناغێك یان ڕاڕەوێکە بۆ پەڕینەوە لە پردی باوەڕو واقیعبینی بۆ پلەی یەقین و دڵنیایی وەك ئەوەی بۆ غەزالی هاتە پێش، بەڵام ئەم ڕێگایە نەك پێویست نییە، بەڵکو بە هەڵەش دادەنرێت، چونکە گومان کردن لەوەی تۆ شت

دەزانیت و دەتوانی بە (هەست و عەقڵ) پەی بە شتەکان بەریت، نکوڵی کردنە لە ڕاستی و واقیعێکی سەلمێنراو.

٤- مرۆڤ بەرپرسیارێتی و ئەرکی خوداناسی و پەرستش و فێربوونی خراوەتە ئەستۆ، ئەمەش بەندە بە زانست و مەعریفە، ناشکرێ خودا داوای ئەنجامدانی شتێك لە مرۆڤ بکات توانای زانین و پەی پێبردنی نەبێت.

٥- تاکە چارەسەر بۆ رزگاربوون لە تەنگژەو کێشەی زانین و نەزانینی مرۆڤ و توانای بۆ بەدەستهێنانی مەعریفەو گەیشتن بە یەقین، بریتییە لە چارەسەری خۆڕسکی (فطري)، کە خۆی لە چارەسەری خوداییدا دەبینێـتەوە بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی زانین (عەقڵ، هەست) بۆ پەی بردن بە شتە هەستپێکراوەکان. بۆ ئەو شتانەشی لە دەرەوەی هەستەکان و توانای پەیبردنی عەقڵی مرۆڤدان، ڕێگەی سروش و پەیامی خودایی لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە دەرمانی دەردانە بۆ زانین و پەی بردن بە جیهانی نەبینراو.

ئەم چارەسەرە دڵی مرۆڤ ئاو دەدات و لە هەموو گومان و دوودڵییەك رزگاری دەکات و، (یەقین)ی پێ دەبەخشێت، کە دەبێتە مایەی ئاسوودەیی و ئۆقرەیی دەروونی بۆ مرۆڤەکان.

# سەرچاوەکان

**یەکەم: بە زمانی عەرەبی**

دوای قورئانی پیرۆز.

أ- کتێب

١ـ أحمد إبراهيم علي الورتي ( دكتور) – مشاريع الإصلاح في الشرق الأوسط، ط١، دارالزمان، دمشق، ٢٠١٢.

٢ـ حربي عباس عگيتو (دكتور) و موزه محمد عبيدان (دكتور) – مدخل إلي الفلسفة و مشكلاتها، ط١، دار النهضة العربية، بيروت، ١٤٢٣ ﻫ – ٢٠٠٣م.

٣ـ راجح عبدالحميد الكردي ( دكتور) – نظرية المعرفة بين القرآن والفلسفة، ط١، مكتبة المؤيد، الرياض، ١٤١٢هـ – ١٩٩٢م.

٤ـ سعد الدين التفتازاني– شرح العقائد النسفي المحشي، ط ٢، انتشارات سيديان، ١٣٥٢هـ ش.

٥ـ عبدالرحمن بن خلدون – مقدمة ابن خلدون، تحقيق حامد أحمد الطاهر، دار الفجر للتراث، القاهرة، ٢٠٠٤.

٦ـ عبدالرحمن بن زيد الزنيدي (دكتور)– مصادر المعرفة في الفكر الديني والفلسفي، مكتبة المؤيد، الرياض، ١٤١٢ﻫ –١٩٩٢م.

٧ـ عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني – العقيدة الإسلامية و أسسها، ط٢، انتشارات بيان، باوه، ايران، ١٣٩٩هـ – ١٩٧٩م.

٨ـ عدنان سبيعي – الفلسفة من تأريخ الفكر الفلسفي، ط١، دار العصماء، دمشق، ١٤٣٣ هـ – ٢٠١٢م.

٩ـ علي حسين الجابري ( دكتور)– دروس في الفكر الإسلامي، ط١، دار الغرقد للطباعة والنشر والتوزيع، دمشق، ٢٠١٠م.

١٠ـ علي حسين كركي ( دكتور) – الإبستيمولوجيا في ميدان المعرفة، ط١، شبكة المعارف، بيروت، ٢٠١٠.

١١ـ الغزالي، حجة الإسلام محمد بن محمد – المنقذ من الضلال، مكتبة الجندي، القاهرة، ١٩٧٢.

١٢ـ الغزالي، محمد بن محمد الغزالي أبو حامد – إحياء علوم الدين، ج١، دار المعرفة، بيروت.

١٣ـ محمد تقي مصباح اليزدي – الإيديولوجية المقارنة، ترجمة عبدالمنعم الخاقاني، دار المحجة البيضاء، بيروت، ١٤١٣هـ، ١٩٩٢م.

١٤ـ محمد محمد الحاج حسن الكمالي (دكتور) – محاضرات في الفلسفة الإسلامية، ط١، مجد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ١٤١٣ هـ – ١٩٩٣م.

١٥ـ مصطفي حسن النشار (دكتور) – أعلام الفلسفة حياتهم ومذاهبهم، دار المسيرة، عمان، ١٤٣٢هـ – ٢٠١١م.

١٦ـ نبيل عبدالحميد عبدالجبار ( دكتور) – الفلسفة لمن يريد، مطبعة الحاج هاشم، اربيل، ٢٠٠٤.

١٧ـ يوسف كرم – تأريخ الفلسفة اليونانية، دار القلم، بيروت، دون سنة الطبع.

**ب– فەرهەنگ و کتێبەکانی زمان**

١٨ـ الجرجاني، السيد الشريف علي بن محمد الجرجاني – التعريفات، ط ٢، انتشارات ناصر خسرو، طهران، ١٣٦٦ هـ ش.

١٨ـ الجوهري، اسماعيل بن حماد الجوهري – معجم الصحاح، ط ١، دار المعرفة، بيروت، ١٤٢٦ هـ م٢٠٠٥.

٢٠ـ الرازي، أحمد بن فارس بن زكريا القزويني الرازي، أبوالحسين– معجم مقايس اللغة–، تحقيق عبدالسلام محمد هارون، دار الفكر، ١٣٩٩ هـ – ١٩٧٩م.

٢١ـ الراغب الاصفهاني– معجم مفردات الفاظ القرآن، تحقيق نديم مرعشلي، دار الكتاب العربي، ١٣٩٢هـ– ١٩٧٢م.

٢٢ـ عبدالمنعم الحفني (دكتور) – المعجم الشامل لمصطلحات الفلسفة، ط٣، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٠.

٢٣ـ الفيروز آبادي، مجد الدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي – القاموس المحيط، ط٢، دارالمعرفة، بيروت، ١٤٢٨هـ ٢٠٠٧م.

٢٤ـ الموسوعة الفلسفية المختصرة، نقلها عن الإنجليزية فؤاد كامل و جلال العشري و عبد الرشيد الصادق، مكتبة النهضة، بغداد، ١٩٨٣م.

## دووەم: بە زمانی کوردی (کتێب)

٢٥- ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل – ئەپستمۆلۆژیاو فەلسەفە، بەرگی یەکەم، چ٢، چاپخانەی شیهاب، ٢٠١٢.

٢٦- کریستۆڤەر هامیلتۆن – مەعریفەتناسی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە بۆ کوردی: بەڵێن ئەنوەر عەلی، دار المعرفە، بیروت، ٢٠١٢.

٢٧- مسعود عبدالخالق - ڕەوشی فەلسەفی سەدەی ٢١، چ١، نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن، هەولێر، ١٤٣٤ ك – ٢٠١٣ز.

٢٨- موحسین موحەممەد حوسێن ( دکتور) – سروشت و مەعریفە و فەلسەفەی مێژوو، چ١، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١.

## سێیەم: بە زمانی فارسی (کتێب)

٢٩- تأريخ فلسفەی راتلج، مجموعە نوسيندگان، ترجمەی حسن مرتضوي، چ١، نشر چشمە، تهران، ١٣٩٠ هـ ش.

٣٠- لئو راوچ – فلسفە هگل، ترجمە عبدالعلی دست غیب، نشر پرسش، اصفهان، ١٣٨٢هـ ش.